101

له پێناو گەلێکی
خاوەن بڕیاردا

# بڕیار

ساڵی نۆیەم

تشرینی دووەمی ٢٠١٦



مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕیو
گەشەپێدانی مرۆیی

یەکەمین گۆڤاری کارگێڕیو
گەشەپێدانی مرۆیی لە کوردستاندا



## بێ باران نامرین

## هەمیشە سادە بژی!

## نرخی وڵات

## لەگەڵ کتێبدا



گۆڤاری بڕیار یەکێکە لە سەرچاوەکانی
گوتارەکانمو ئیلهامبەخشی زۆر گوتارم بووە.

## چۆن ببم بە سەرکردە؟

خاوەنی ئیمتیاز

د. مەسعوود تاهیر ڕۆژبەیانی

سەرنووسەر

د. عادل محەممەد شێخانی

sarnosar@yahoo.com

بەڕێوەبەری نووسین

بەرزان ئەبوبەکر

دەستەی نووسەران

ئەسکەندەر ڕەحیم

بێگەرد فارس

زاهیر زانا

محەممەد مێرگەیی

محەممەد هاشم

وەهاب حەسیب

یەحیا محەممەد

دیزاین

پشتیوان عبدالرحمن

تایپ

کەلسووم جەلال

ڕاوێژکاری یاسایی

پارێزەر: ئازاد محیّدین

تشرینی دووەم

2016

No: 101

ناونیشانی گۆڤار

سلێمانی: گەڕەکی باخان- شەقامی بۆتان- خانووی ژمارە ٧٤ تەنیشت

باخچەی بەکر صدقی، بەرامبەر کینگ سپۆرت

٠٧٤٨٠١١٢٧٨٧ - ٠٧٧٠٢١٧٨٦٨٢

هەولێر: ٠٧٥٠٤٤٦٣٢٣٠

bryarmagazine

bryarmagazin@gmail.com

bryarmagazine

چاپ: پیرەمێرد

دابەشکردن: پەیک/ 07708649210

نرخ: 2500 دینار

# بڕیار


مانگنامەیەکی تایبەتە بە کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی

ساڵی نۆیەم - ژمارە 101 - تشرینی دووەم 2016


## کارگێڕیو بازاڕسازی















# هەمیشە سادە بژی!

زانایـەك دەڵێـت: دەوڵەمەندترین كەس، ئەو كەسـەیە كـە دەتوانێت، لە سادەترین شتدا، خۆشی خۆی بەدەست بهێنێت!

ئەم وتەیەش زۆر جوانە؛ چونكە سـەرچاوەی خۆشییەكان، خودی مرۆڤە.. نەك شتومەكو كاڵاكانی دەوروبەری!

دەوڵەمەندیو بەختەوەریو چێژوەرگرتنو شادیو كامەرانیو هیوا، خودی مرۆڤ درووستی دەكات!

لە بەرابەریشـدا: داماویو كەساسـیو دڵتەنگیو نیگەرانیو خەمو پەژارەو بێزاری لە ژیانو بێهیوایی، هەر بەرهەمی خودی مرۆڤ خۆین، ئەگەر خەزنەداری مولكی قاروونیش بێت!

بەڵكو هەر كاتێك لاشە غەرقی ڕەفاهییەتو تەرەفو نازونیعمەتی بێشومار بوو؛ ڕۆح نیگەرانو ئاڵۆزو لاواز دەبێت!

بە لاوازبوونی ڕۆحیش، هەموو خۆشییەكان دەبزركێنو كاڵ دەبنەوە!

چێژوەرگرتن لە تریفەی مانگەشـەوو بریسكەی ئەستێرەكان زۆر خۆشترە لە دانیشتن لە ژوورێك كە بە سورەییاو دەیان گڵۆپی كارەبایی ڕۆشنكراوە!

گوێگرتن لە خوڕەی ئاوی تاڤگەی سـەر كەژانو جریوەی بولبولو شنەبای ئێوارانی بەهار، زۆر خۆشـترە لە تەماشـاكردنی دیمەنی فیلمەكان لە شاشەیەكی (HD)دا.

خواردنەوەی چایەك لە كترییەكی ڕەشدا، كە بە خەڵووز لێنراوە، لە قاوەو نیسكافێی بەناوبانگترین كۆفی شۆپ بەلەزەتترە!

پێویسـت بـە دووركەوتنەوە نـاكات، بۆ گەڕان بە شـوێن خۆشـییەكانو دۆزینەوەیان!

دانیشـتنێكی خێزانـی، دەرچوونێك لەگەڵ دۆسـتو خۆشەویسـتاندا بۆ شوێنێكی زۆر سادە..پشوویەك دەدات بە ڕۆحتو لە ئاڵۆزیی ئەم ڕۆژگارە ڕزگارت دەكات.

دانیشـتن لە كۆڕی كەسـانی زاناو شـارەزاو ئەدیبو خوێندەوارا، ئارامیو هێمنی دەبەخشێ بە دەروونت، لە جیهانی ماددە ڕزگارت دەكاتو جیهانێكی دیت پێ دەناسێنێ!

چی دەبێ جارجارێك خۆت لە بازاڕو ژاوەژاوی ئەم ڕۆژگارە ڕزگار بكەیتو بە هاودەمی كتێبێك بۆ نێو جیهانێكی ئەفسووناوی خۆش سەفەر بكەی!

خۆشـییەكانی خۆت، هێندە مەبەسـتەوە بە جـۆری ئۆتۆمبیلو خانوو و خواردنو كاڵاو شتومەكو جلوبەرگەكانت!

ئەوەی تۆ بۆی دەگەڕێی لە ناختایە، نەك لە رووكەشتدا!

تـا سـادەتربژیت، بەختەوەرتـری، خۆشەویسـتری، ئاسـوودەتری، ژیان بەسادەیی وەربگرەو هێندە قورسی مەكەو باری شانت قورس مەكە!

زۆربەی ئەو شتانەی كە ئاواتیان پێ دەخوازیت، بوونو نەبوونیان یەكە!

زۆرێك لەو شـتانەی بە شـوێنیاندا وێڵی، ئەو شـتانە نین كە پێویسـتت پێیەتی!

بەڵكو سەربەسـتیی تۆ، لە ئازادبوونتدایە لەو هەموو شـتانەی كە ڕۆژانە عومرت بەبا دەدەنو كۆڵی سەرشانت قورس دەكەن!



# کارگێڕی بە گوفتار

مستەفا غەلالینی

بێهیوایی دەست بەسەر هەر کەلێکدا بگرێت، ونی دەکات.. تێکەڵی دڵی هەر کەلێک ببێت، لاوازی دەکات.

ئانا کرسیس

بێهیوا مەبە مادەم لە ژیاندایت، دەتوانیت بەختەوەری بە هیواو ئاوات بەدەست بهێنیت، سەرکەوتنیش بە کارکردن.

بوفی

ئەگەر هەموو شتێکت لەدەست دا، هەر بێهیوا مەبە؛ چونکە تۆ خاوەنی ئایندەیت..

فەیلسوف

بێهیوایی، چارەنووسی پاڵەوان دەگۆڕێت بە ترسنۆک.

حەکیم

هاوار بۆ ئەو کەسانەی لەگەڵ یەکەم شکستدا تەسلیم بە شکست دەبن؛ چونکە ئەوانە ژیانیان لەدەست دەدەن.




# نرخی وڵات

دەگێڕنــەوە: لە ســەردەمی پێشــوودا، قەســابەکانی شــاری ســەمەرقەند، هاتنە لای ســوڵتانی ســەمەرقەند، گلەیی ئەوەیان کرد، کە قازانجی گۆشتفرۆشتنیان زۆر کەمە!

داوایــان لە ســوڵتان کرد، کــە ڕێگایان بدات، نرخی گۆشــت گرانتــر بکەن، ئێمەش لە بەرامبەردا هەزار دینار بە گەنجینەی دەوڵەت دەبەخشین!

سوڵتانی سەمەرقەند، فەرمانیدا پارەکە بهێنن بۆ گەنجینەو پاشان بەو نرخەی دەیانەوێ، بیفرۆشن.

کاتێــك پارەکەیــان گەیانــدە گەنجینــەو نزخی گۆشــتیان بەرزکردەوە، سوڵتان دەستووری بەنێو شاردا دەرکرد: هەرکەسێك گۆشت لە قەسابەکان بکڕێت؛ سزا دەدرێت.

بەم بڕیارەش، کەس گۆشــتی لێیان نەکڕیو گۆشتفرۆشەکان زیانێکــی زۆریــان کردو جارێکــی دی، هاتنەوە لای ســوڵتان کە ئامادەن بە نرخەکەی پێشوو بیفرۆشن!

کاتێك ســوڵتان ئەمەی بینی، پێی گوتن: کەی ئەوە پیاوەتیو مەردایەتییە، کە من گەلەکەم بە "١٠٠٠" دینار بفرۆشم!!

**لەم چیرۆکەوە فێر دەبین:**

١. دەبێت بەرژوەندیی گەلو وڵات، بخرێتە پێش بەرژوەندیی خودی تاکەکەسی.

٢. نابێت ڕێگە بە کەســانی هەلپەرســتو چاوچنۆك بدرێت، کە بۆ ســوودو قازانجــی خۆیان، زیان بــە بەرژوەندیی خەڵکیو سەروەتو سامانی گشتی بگەیەنن.

٣. دەبێــت دەســەڵاتدار وەك باوکێکــی دڵســۆز، هەمیشــە خەمخۆری میللەتو هاونیشتمانیانی خۆی بێت.

٤. دەبێــت قوتی خەڵكو ئابووریی وڵات، هێڵی ســوور بێتو کەس نەتوانێت بیبەزێنێ.

٥. یاریکردنو دەسکاریکردنی بژێویی هاوڵاتیان، نابێت کارێکی ســەرپێیو بڕیارێکی خێــرا بێت؛ چونکە ئــەو کارە، کاریگەریی گرنگیی هەیە لەسەر ژیانو گوزەرانی خەڵك.

٦. نابێت تەنها بەرژەوەندیی تایبەتو پڕکردنی گەنجینەکان، پێــوەری هەموو شــتێك بێت، کۆکردنەوەی ســەروەتو ســامانی بێبەرنامە، بەختەوەریو خۆشگوزەرانی دابین ناکات.

٧. دەبێــت دەســەڵات، شــەوو ڕۆژ ئاگاداری بــازاڕ بێت، نەك هاوڵاتیــان لــە ترســی بەرزکردنــەوەی نزخی شــتومەكو باجو خزمەتگوزاری، شەوانە خەویان لێ نەکەوێت!

# تەنها بۆ سەرکردەکان

مرۆڤی برسی، ناتوانێت ببێت بە کەسێکی دڵسۆز
بۆ نیشتمانەکەی.

نەزانراوە

مرۆڤ سێ جۆرە:
یەکەمیان:وەکو هەوا وایە، هەرگیز ناتوانین دەستبەرداری بین‌و لێی بێ نیازبین.
دووەمیان: وەکو دەرمان وایە، تەنها لە کاتی پێویستیدا نیازمان پێیانە.
سێیەمیان: وەکو دەردو نەخۆشی وان، هەرگیز پێویستمان پێیان نییە.

مەئموون

مرۆڤ هەتا ئاکار جوانترو ڕەوشتی بەرزترو چاکەکار تربێت،
ترسی لە مردن کەمتر دەبێتەوە.

سەمۆئیل
جۆنسۆن

لەسەر ڕێگەی سەرکەوتن، هیچ ئاماژەیەک
دانەنراوە، ؛ تا ئەوپەڕی خێراییت بۆ دیاری بکات!

دەیفد
جۆنسۆن

پشوودرێژی دەرناکەوێت، تەنها لە کاتی
سەرکەوتندا نەبێت، هەروەکو چۆن لێبوردەییش
دەرناکەوێت، تەنها لە کاتی دەسەڵاتدا نەبێت.

پەندێکی
عەرەبی

# بەڕێوەبەرانی بەرپرس، چۆن کار دەکەن؟

بەڕێوەبەری پرۆژەی مانگی دەستکردی هیندستان دەگێڕێتەوە: ساڵی ١٩٧٣ بەڕێوەبەری گەڵاڵەنامەی دروستکردنو هەڵدانی مانگی دەستکردی هیندستان بووم، ئامانجی ئێمە، دانانی مانگی دەستکردی هیندستان لە ڕێڕەوی خۆی دابوو، تا ساڵی ١٩٨٠.. بودجەو سەرمایەی مرۆیی پێوستم خرا بووە بەردەست.. ڕاشکاوانە پێم گوترابوو: دەبێت تا ساڵی ١٩٨٠، مانگەدەستکردەکە ڕەوانەی بکەین.. هەزاران کەس، پێکەوە لە گرووپە زانستیو هونەرییەکان، بۆ گەیشتن بەو ئامانجە کاریان دەکرد.

مانگی هەشتی ساڵی ١٩٧٩، ئێمە دڵنیابووین کە بۆ هەڵدانی مانگەدەستکردەکە ئامادەین، بەپێی ئەوەی من بەڕێوەبەری پرۆژەکە بووم، چووم بۆ بنکەی کۆنترۆڵی هەڵدانەکە، چوار خولەك پێش هەڵدانەکە، کۆمپیوتەر دەستی بە تێستو تاقیکردنەوەی بابەتە ڕێکخراوەکان کرد، خولەکێك دواتر، بەرنامەیەکی کۆمپیوتەری تێستەکەی ڕاگرتو پیشانی دا کە چەند گرفتێك لە پێکهاتەکانی بەرنامەکەدا هەیە.. پسپۆڕە هاوڕێکانم گوتیان: مایەی پەرۆشیو نیگەرانی نییە.. ئەوان چەند کارێکیان ئەنجام داو گوتیان دەتوانن درێژە بە کارەکە بدەن.. ئیدی بەرنامە کۆمپیوتەرییەکەم وەستاندو گۆڕیم بۆ باری دەستی.. دەستم نا بە دوگمەی هەڵدان.. لە قۆناغی یەکەمدا هەموو شتێك بەباشی بەڕێوە دەچوو. لە قۆناغی دووەمدا، گرفتێك هاتە پێش، لەبری ئەوەی مووشەکەکە بەرەو ئاسمان بڕوات، کەوتە ناو کەنداوی بەنگال. ئەمە شکستێکی یەکجار گەورەبوو!!

هەڵدانەکە سەعات ٧ کرابوو، سەرۆکی دەزگای تۆژینەوە ئاسمانییەکانی هیندستان، سەعات ٧:٤٥ خولەکی بەیانی، کۆنفرانسێکی ڕۆژنامەوانی بە ئامادەبوونی ڕۆژنامەنووسانی ناوخۆو دەرەوە ساز کردو لەپشت مێزی گوتاربێژییەکەوە ڕاوەستاو گوتی: بەرپرسیارێتیی ئەم شکستە لەئەستۆ دەگرم.. پاشان گوتی: ئەو گرووپەی لەژێر سەرکردایەتیی مندا، زۆر بەچاکی کاریان کردووە، بەڵام پاڵپشتیی زانستی زیاتریان پێویست بووە.. ئەمجا دڵنیایی دا بە ڕاگەیاندنەکان کە ساڵی داهاتوو، مانگەدەستکردەکە بەسەرکەوتوویی هەڵدەدرێت.. وێڕای ئەوەی من بەڕێوەبەری پرۆژەکە بووم، بە بەڵگەی کۆتایی هەڵە لە منەوە بوو، بەڵام ئەو بەو ناونیشانەی سەرۆکی دەزگا بوو، بەرپرسیارێتیی هەڵدانەکەی لەئەستۆ گرت.

ساڵی دواتر، لە مانگی ٧ی ١٩٨٠، مانگەدەستکردەکەمان هەڵدایەوە، ئەم جارە سەرکەوتوو بووین، خەڵکی تێکڕا خۆشحاڵ بوون.. دووبارە کۆنفرانسێکی ڕۆژنامەوانی ڕێك خرا، سەرۆکی دەزگای لێکۆڵینەوە ئاسمانییەکان، لە لاوە پێی گوتم: "ئەمڕۆ تۆ کۆنفرانسە ڕۆژنامەوانییەکە ساز دەکەیت"!

ئەو ڕۆژە، وانەیەکی زۆر گرنگ فێربووم: کاتێك هەڵەو گرفتێك هاتە پێش، سەرۆکی دەزگا، ئۆباڵەکەی لە گرێی گەردنی خۆیدا دانا، کاتێکیش سەرکەوتین، ئەو سەرکەوتنەی خستە پاڵ گرووپەکەی.. باشترین وانەی بەڕێوەبەرێتیش کە فێری بووبم، لە خوێندنەوەی کتێبەکانەوە بەدەستم نەهێناوە، بەڵکو لەو ئەزموونەوە پەیدابوو.





# چۆن ببم بە سەرکردە

ڕەنج خەراجیانی ..... لە زیندانەوە

کاتێك ئێمەی مرۆڤ، بە هەر هۆکارێك لە هۆکارەکان، تووشی سزایەکی یاسایی دەبینو دێینە ناو زیندان، ئینجا تاوانبار بین، یاخود بێتاوان، هەندێکمان یەکسەر هەستێك لە ناخیدا چەکەرە دەکاتو هەمیشە بۆ کەسانی دەوروبەر، یان لەناخی خۆیاندا هەمیشە دەڵێن: (تازە ئێمە فەوتاین، یان ئیتر من لەناوچووم، ئای هەموو شتێکم لەدەست دا، تازە هەرچی بکەم ناگەمەوە ئاستو باری ڕابوردووم).

هاوڕێ لێرەدا پرسیارێکی زۆر مەنتیقییانە دێتە پێش، ئەو ئاستو ڕابوردووەی کە باسی دەکەیت، ڕۆژگارێك بووە کە نەتبووە، بەڵام بە هەوڵو تێکۆشانت بەدەستت هێناوە، دە کەواتە: دەتوانیت دووبارە بگەیتەوە بە هەمان ئاست، یان زیاتریش.

ئێمەی ئادەمیزاد بەجۆرێك دروست کراوین، بیرکردنەوەمان هەرجۆرێك بێت، خراپ بێت، یاخود باش، ئەوە ڕوو دەدات کەخۆمان دەمانەوێت.

ئەگەر بەباشە لە شکستەکان بڕوانینو بڕوایەکی تەواومان پێی هەبێت، درەنگ بێت، یاخود زوو، دڵنیاین هەموو دەرگاکان بە ڕووماندا دەکرێنەوە، تەنیا چەند بیرکردنەوەیەکی ئاسان هەیە ئەو کاتانەی کە دڵتەنگیت بهێنەرە بەرچاوت، ژیانت بیرکردنەوەکانت تەواو دەگۆڕێن.. وەك:-

1. بیهێنەرە بەرچاوت لەگەڵ ئەو سزایەی سەپاوە بەسەرتدا، بارێکی ترت لەسەرشان بوایەو خاوەن پێداویستیی تایبەت بوویتایە.

2. ئەگەر بێباوەڕ بوویتایەو تەنانەت لەنێوان چوار دیواریشدا دروستکەری خۆتت نەناسیبایە.

3. ئەگەر سزاکەت وەك هاوڕێکانت، لە جێگای چەند ساڵێك چەندینو چەندین ساڵ بووایە.

با هەمیشە گەشبینانە بیر بکەینەوە؛ تا ژیان بۆمان پێ بکەنێت، خودی خۆمان دەتوانین ئاراستەکان بگۆڕین بیر بکەرەوەو هەمیشە بەخۆت بڵێ:-

أ- هەموو کات وەك بەخششێك بیر لەم سزایە بکەرەوەو بە پاککەرەوەی هەڵەو تاوانەکانت سەیری بکەو سوپاسگوزاربە لەسەری.

ب- با زیندان بکەینە زانکۆو خوێندنگایەك، بۆ ئەو کەسانەی هەمیشە بەچاوێکی ترەوە، سەیری سزا دراو دەکەن، بیسەلمێنینو پێیان بڵێین: کە ئێوە هەڵەن من سزا دراوم بەڵام:

* لەزیندان خوێندنم تەواو کرد.
* لەزیندان هەمیشە لەکارو چالاکیو بۆنەکاندا بەشداریم دەکرد.
* لە زیندان فێر بووم کە بە چاوی کەم لە هیچ شتێك نەڕوانم.
* لە زیندان فێر بووم قەدری هەموو شتێك بگرم.
* لە زیندان بەدوای خۆمدا گەڕامو کۆڵم نەدا، هەتا خۆمم دۆزییەوە.
* لە زیندان فێری کارو پیشەیەك بووم؛ تا بتوانم لە دەرەوەش بژێوی خۆمی پێ بەدەست بهێنم.

هاوڕێ گیان، تۆ دەزانی هەمیشە گەورەکان ئەو کەسانەی لە ڕابوردوو، لە داهاتووشدا سەرکردەیان لێ دروست دەبێت، لە زیندانەوە بناغەی داهاتووی خۆیان داناوەو هەمیشە بەدیوە باشەکە بیریان لە زیندان کردووەتەوە، وەك (سەید قوتب، ماندێلا......).

با ئێمەش لەم ساتەوە، بڕیار بدەین کە ببینە ئەو کەسەی دەوروبەرمان دەیەوێت، ئەو کەسەی کۆمەڵگاکەمان دەیەوێت، ئەو کەسەی داهاتووی وڵاتەکەمان دەیەوێت، هەر نەبێت ببینە ئەو کەسەی خودی خۆمان دەمانەوێت؛ تا سەرمان بەرز بێتو هەمیشە شانازی بەخۆمانەوە بکەین.

شەرمیش نەکەین گەر بڵێین ڕۆژێك لە ڕۆژان سزادراو بووین.

# بنەماکانی فێربوون

### ٣. ئەنجامدان، پاشان، ئەنجامدان، دیسان ئەنجامدان

هەر کارێك زۆرتر ئەنجامی بدەیت، ئەوە سەلیقەی زۆتری تێدا پەیدا دەکەیتو بەدەستوبردتریش دەبیت.

هەر کارێکیش تێیدا بەسەلیقەو بەدەستوبرد بوویت؛ شەیدای دەبیتو حەز بە ئەنجامدانی دەکەیت..

ئیدی هەر بەم شێوەیە..

برووسلیش دەڵێت:

**لە کەسێك ناترسم، کە دەهەزار جۆر جووڵەی، یەکی یەك جار ئەنجام دابێت..، بەڵام لە کەسێك دەترسم، کە دەهەزار جار، یەك جۆر جووڵەی ئەنجام دابێت!**

### ٤. ڕکابەریی چاك، فێربوون خێراتر دەکات

هەندێـك کـەس، ڕکابەری هانیـان دەدات، تـا زیاتر ببەخشنو خۆیان زیاتر بۆ ئەو کارە تەرخان بکەن.

وەلێ پێویستە ڕکابەری بە بێگەردیو نیازپاکی بنەخشێتو گوشاری کارو خێراپەڕاندن، زۆر بەنەرمیو وردی ئەنجام بدرێت، هەر یەکێکیشمان ڕکابەریی خۆمان بکەین؛ چونکە کاتێك هـەر یەکێك لە ئێمە، لەگەڵ خۆیدا ململانێ دەکات، کەس نادۆڕێتو هەموو لایەك براوە دەبن.

### ٥. فێربوون، بە چەند بازدانێکدا تێ دەپەڕێت

ئاستی فێربوون، چەماوەیەکی ئاسایی، یان ڕاستەهێڵێك نییە، بەڵکوو پەیژەیەکی پلەدارە.. جا کە یەکێکمان دەچێتە ئاستێکی بەرزتر، وا دەردەکەوێت، هەرگیز بۆ ئاستەکەی دواتر بـەرز نەبووەتەوە، بەڵام بە کۆڵنەدانو بەردەوامی لە ڕاهێنانو هەڵسەنگاندنی ئەنجامەکان، دەکرێت ئاستی خۆی بەرز بکاتەوە.

کەواتـە: دەبێت بەبێ پەلەپرووزێو پەشێوی، هانی خـۆتو کارمەندەکانت بدەیت؛ تا بەو کارانە، بە شتێك لە ئۆقرەییی بگەن، بەچەشنێك هەنگاوی پێشڕەویی دواتر، بەهەندو وەربگیرێتو لە کاتی شیاوی خۆیدا بێت.

### ٦. فێربوون پێویستی بە نێرەرو وەرگر هەیە

مامۆستاو فێرخواز، لە ئەنجامەکان بەرپرسن.. ڕەنگە وەك ڕاهێنەرێـك زۆر ئاسـان بێـت، لاوازیـی ڕاهێنراو، بۆ دەرەنـگ فێربوونی ئەو بگێڕێتەوە.. هەروەها ئاسـانە وەك ڕاهێنراوێك، بەرپرسیارێتی بخەیتە سەر ڕاهێنەر.

هـەردووڵاش بەرپرسـن لـە ئەنجامـەکان، شکستی یەکێکیان، شکستی ئەوی دیکەیە.

### ٧. مادەی ڕاهێنانەکە، بۆ چەند قۆناغێك دابەش بکە

ڕاهێنراو، پێویسـتی بە کاردانەوەی ئەرێنیو بەردەوام هەیـە، ئەمەش ئـەوە دەخوازێت، کە زانیارییەکان بەسـەر چەند سووکەژمێکدا دابەش بکەیت؛ بۆئەوەی تائەندازەیەك بەخێراییەکـی شـیاو وەری بگرێتو لێی تێ بگات، پاشـان ئەزموونی بکاتو جێبەجێی بکات، یان بیکات بە بەرکولێك بۆ ڕاهێنانەکانی دواتر.



**بەشی دووەم**

ئەوانـــەی لـــە ڕێكخـــراوو كۆمەڵگەكاندا، جیاوازی درووست دەكـەن، ئەوانـە بیریارانـن، هەرچەنـد لێهاتوو شـارەزابین لە ڕاپەڕاندنی كارەكانمان؛ ناتوانین دەسـبەرداری بیركردنەوە بین؛ چونكە ئەگـەر كەمێك ورد ببینـەوەو بڕوانین؛ ئـەوا دەبینین هۆی سـەرەكی پێشـكەوتنی وڵاتو ڕێكخراوەكان، ئەوەیە كە ڕێز لە بیركردنەوەی نوێو كەسـانی بیریار دەگرن، نەبووە تا ئێسـتا گوترابێـت ڕێكخراوێـك، یان شـوێنێك دواكەوتوە لـە ئەنجامی گوێگرتن لە كەسـانێك كە بیری داهێنەرانەیان هەبووە، هەریەك لە ئێمـە دەتوانێت بیری جـوانو داهێنەرانـەی هەبێت، ئەگەر ڕەچـاوی ئەم خاڵانە بكاتو كاریان پێ بكات. بیركردنەوەی نوێو داهێنەرانـە وا دەكات كە ژیانمان باشـترو بەرەو پێشـتر بباتو هەلی كارمان بۆ فەراهەم بكات...

١. دانانی خشـتەیەك لەسەر ئەو كەلوپەلو خزمەتگوزارییانەی كە خۆت نارازیت لێی: ئایا قەت هەبووە شـتێكی تازەت كڕی بێتو هیچ سوودت لێ نەبینی بێت، لەبەر ئەوەی كە كێشەیەكی هەبووە ئەگەر بووەو دەتوانیت چارەسەری گونجاو بۆ ئەو كێشە بدۆزیتەوە؛ ئـەوا دەتوانی بڕۆیت لەگەڵ ئەو شـوێنەدا قسـە بكەیت، ئەمەش دەبێتە هەلێكی باش بۆ كاركردن بۆخۆتو ڕەنگە بۆ كەسانی تریش.

٢. بـەردەوام بخوێنەرەوە.. بخوێنەرەوە، پاشـان كار بكە بەو زانیارییـە نوێیانە بە كردار: باشـترین كار كـە بیكەیت، ئەوەیە هەمیشە سووربیت لەسەر خوێندنەوەو زانیاریی نوێ كۆ بكەیتەوە، ئەمەش وا دەكات كە هەمیشە بیری جوانو تازەت لا گەڵاڵە بێت، كە پێشـتر نەبووە، ڕەنگە لە سـەرەتادا خوێندنەوە سـوودت پێ نەگەیەنێت، بەڵام بە دڵنیاییەوە لە داهاتوودا سوودی زۆر دەبێت، ئەگەر كار بەوە بكەیت كە لە خوێندنەوەدا فێری دەبیت.

٣. سـەیری هەواڵـەكان بكـە: سـەیركردنو بەدواداچـوون بـۆ ڕۆژنامـەو گۆڤـارو تەلەفزیۆنـەكان هۆكاری سـەرەكین بۆ دۆزینـەوەی بیـری نوێ لە ناویانـدا؛ چونكە هەمیشـە چاویان لەسـەر ئـەو كەلوپەلو خزمەتگوزارییانەیە كـە بوونی نییە بێ ئەوەی چارەسـەرێكی بۆ بدۆزنەوە، ئەمەش وا دەكات تۆ سـوود لـەوە ببینـیو ببێتـە هۆیـەك بۆ كارێكـی نوێ بۆ تـۆ، ڕەنگە زۆرجاریش ببێت بەهۆی درووسـتبوونی ڕێكخراوێكی بچووك بۆ چارەسـەركردنی ئەو كێشەو گیرو گرفتانە، ئەمەش وا دەكات كە كەسانی تریش سوودمەندبن.

٤. بڕوانـە ئەو خزمەتگوزاریو كارانەی كـە لە وڵاتانی نزیك بـە وڵاتەكەی تۆ كراوەو سـەركەوتوو بـووە: چاودێریی ئەو كارو پرۆژەو بەرهەمە تازەنە بكە كە لە وڵاتانی تر جێبەجێ دەكرێتو سەركەوتوو بووە، دەكرێت تۆش بە هەمان شێوە لە وڵاتەكەی خۆتدا دەستپێشخەری بكەی بۆ ئەو كارانە، بە گۆڕانكارییەكی بچووك كە لەگەڵ كەلتوورو دابو نەریتی وڵاتەكەی خۆتدا دەگونجێت.

٥. چاودێری ئەو گۆڕانكارییە یاساییە نوێیانەی ڕوو دەدەن بكە: زۆر جار ئەو یاسا نوێیانەی كە دەردەكرێن، یاخود گۆڕانكارییان تێدا دەكرێت، دەكرێت سەرچاوەیەكی باش بن بۆ بیری نوێ، بۆ نموونە: ڕەنگە ئەو بڕیارە تازە پەیوەست بێت بە ئامێرێكی نوێوە كە نەبێت، یان كەم بێت كە ئەو بڕیارانەی پێ جێبەجی دەكرێ، یان كردنەوەی فەرمانگەیەكی حوكمی لە شـوێنێ كە هیـچ خزمەتگوزارییەكی لێ نییە بۆ نموونە: چێشتخانە، استنساخ، وێنەگر..

٦. ڕاهێنـان بكەو خۆت بۆ كارێكی تر باش ئامادە بكە: خۆت وابەسـتەی تەنها كارێك مەكە كە دەیزانیت، یان ئەو پسپۆڕییەی بە دەسـتت هێناوە لـە خوێندندا، دەكرێت لە بـازاڕو مۆڵەكاندا بگەڕێیـتو بزانیت چ شـتێك نییە، یان چ پیشـەیەك تا ئێسـتا بەباشـی سـوودی لێ وەرنەگیـراوە، تۆ بڕۆیت بەشـداری خولی تایبـەت بكەیـت؛ تا فێر ببیتو سـوودی لێ ببینـی. هەروەها دەتوانیت ئەمـە وەك هیوایەتێك بكەیت، لە هەمان كاتدا لایەنی ئابووریی خۆتی پێ بەهێزترو پتەوتر بكەیت.

٧. یارمەتیـی ئەو كەسـانە بدە كە سـەرقاڵن بـە كارەكانی ڕۆژانەیانـەوەو ناتوانـن كاری ماڵەوەیـان بكـەن: دەتوانیت بیر لـەوە بكەیتەوە كە یارمەتیی ئەو كەسـانە بدەیت كە لە دەرەوە كار دەكـەنو ناتوانـن كارەكانـی ماڵەوەیـان بكەن بـۆ نموونە: (پاككردنـەوەی ماڵو باخچەو گرنگیدان بەو پێویسـتییانەی كە دەكرێت كەسـانی تر بیكـەن، یا كڕینی هەر پێویسـتییەكی تر، كە كاتێكی زۆری دەوێت بۆ ئەو كەسـانەی سەرقاڵن).. ئەمەش وا دەكات ببێتە هەلێكی نوێ بۆ كاركردن..

لەبیـرت بێ: ئەمانـە تەنها چەند پێشـنیارێكن بۆ كاركردن ڕەنگـە بگونجێت، یان نا، بـەڵام بێگومان بـە ڕەچاوكردنی ئەم خاڵانەو بەپێی پێویستیی ئەو شوێنەی تۆی لێیت، بیركردنەوەت بەبەردەوامـی، دەتوانیت بیری جوانترو داهێنەرانەتر بدۆزیتەوە كە هەم خۆتو كەسانی تریش لێی سوودمەند بن.

# بۆ ئەوەی بیركردنەوەكانمان جوانو داهێنەرانەبن!




هەژار سەعید

# ڕۆڵی پڕۆژەی بچوك لە بەهێزكردنی ئابووری وڵاتدا

دەستپێك:

ئابووری، شادەماری حكوومەتە، مەودای سەركەوتنو شكستی بەڕێوەبەرێتیی حكوومەت دیاری دەكات، ئەو وڵاتەی داهاتی مامناوەندیی تاكە كەس تێیدا زۆر كەمە، وڵاتی شكستخواردوونو حكومەتی گەندەڵ بەڕێوەیان دەباتو گەلەكانیان هەوڵی گۆڕانكاری نادەن.

هەركات گەلەكانیان هەوڵی گۆڕانكاریان دا، پێویستە بە هەماهەنگی حكوومەت بێت، لەم نێوەندەدا دەبێت یەكێكیان بەسەر ئەوی كەیاندا زاڵ ببێت، ئەو وڵاتانەی گەندەڵی بەسەر گۆڕانكاریو پێشكەوتن تێیاندا باڵا دەستە، هاوكات داهاتی تاكەكەس ڕوو لە كەمی دەكاتو بێكاریو هەژاری تێدا بڵاودەبێتەوە، كە هاوتایە لەگەڵ بڵاوبوونەوەی توندوتیژیو تاوانكاری.

لە جیهاندا، پێشكەوتنی تەكنەلۆژیا، هۆكارێكە بۆ بێكاریو بێكاری شاراوە، بەتایبەت لە وڵاتە دواكەوتووەكان؛ چونكە كارو بەرهەمی خۆماڵی، ناتوانێت ڕكابەری بەرهەمی بێگانە بكات. كۆمپانیا زەبەلاحەكان، ئەمڕۆ لە شێوەی یەكەو هاوپەیمانێتیی گەورەی ئابووریدا دەردەكەون، هاوكات بە هۆی زۆری سەرمایەو باڵادەستییان لە بواری تەكنەلۆژیادا لە چەندین بواری جیاجیادا كار دەكەن، بە نموونە: كۆمپانیای تۆیۆتای یابانی، كە چەندین جۆر ئامێرو ئوتۆمبێلو بارهەڵگر درووست دەكات، هاوكات لە چەندین بواری دیكەدا سەرمایەگوزاری دەكات، لەوانە بواری تەكنەلۆژیاو دارایی كە بەشێوەیەك كۆی كارەكانی دەتوانێت كاریگەری لەسەر ئابووریو ئاسایشی نەتەوایەتی، گەلێك وڵات درووست بكات. بۆیە وڵاتان هەمیشە لە ڕێگای هاندانی بەرهەمی خۆماڵیو دانانی باج لەسەر بەرهەمە بیانییەكان دەیانەوێت ڕووبەڕووی هەڕەشەو ئاستەنگە دەرەكییەكان بوەستنەوە.

لە جیهاندا پڕۆژە بچووكەكان بەشێكی زۆری داهاتی نەتەوایەتیی وڵاتان پێك دەهێننو ڕۆڵێكی بەرچاو دەبینن لەدابینكردنی بودجەی وڵاتدا. سەرباری ئەوەی بەشێكی زۆری دەستی كاریش لەخۆ دەگرێت.

وەهاب حەسیب محەممەد



## پرۆژە چییە؟

پرۆژە کارێکە تاکێك بیرۆکەیەکی دیاریکراوی تێدا جێبەجێ دەکات، بیرۆکەکە بەرهەمێك، یان خزمەتگوزارییەکە، لە جێبەجێکردنی ئەو بیرۆکەیەدا، هەندێك سەرچاوەی سەرەکی بەکاردەهێنرێت، وەك: سەرچاوەی دارایی‌و زانین، کادری شارەزا، پرۆژە ئاریشەیەکی کۆمەڵگاکەی بەرانبەر بڕێك مادە چارەسەر دەکات، نانەواخانە بە نموونە.

**پرۆژەی بچووك:** پرۆژەیەکی خۆرسکە، شێوازێکی قانوونی هەیەو باج دەدات، بە قانوون بازرگانی دەکاتو ڕێپێدراوە، لە ژینگەیەکی ئاساییدا کار دەکاتو کارێکی مەبەستدارە، پەیوەستە بەژیانو کاتەوە، لە پێناو دابینکردنی بەرهەمێك، یان خزمەتگوزارییەکدا درووست دەکرێت. بە نموونە: دوکانێك، کارگەیەکی درووستکردنی نایلۆنو ...هتد.

### گرنگی پرۆژەی بچووك:

لە بەرەبەیانی مێژووەوە، کارکردن بەشێوەی بچووکو لە بواری خێزانییدا دەرکەوتووە، کە هۆکارێك بووە بۆ خۆژیاندن، هەرچی کۆمپانیا زەبەلاحەکانە لەم دواییانەدا دەرکەوتوون.

بەگشتی بەراورد بە پرۆژەی گەورە، گرنگیدان بە پرۆژەی بچووك بۆ زۆر هۆکار دەگەڕێتەوە، لەوانە بەشداریکردن لە داهاتی نەتەوەیی، هەروەها سەرچاوەی زۆرێك لە بیرۆکەی نوێو داهێنانە. لەکاتێکدا پرۆژە بچووکەکان سەرچاوەی پرۆژە گەورەکانن.

بەو پێوەرەی پرۆژەی بچووك بنەمایەکی سەرەکییە لە زیادکردنی تواناکانی بەرهەمهێناندا، زۆرێك لە ئابووریناسان لە گەشەی ئابووری‌و کۆمەڵایەتیی وڵاتاندا، ڕۆڵی پرۆژەی بچووك بەرز دەنرخێنن، بەتایبەت لە وڵاتە دواکەوتووەکاندا، هاوکات پرۆژەی بچووك، یارمەتیی چارەسەری کێـ ـەی بێکاری‌و هەژاری دەدات، بەشێوەیەکی کرداری‌و بەراورد بە پیشەسازیی گەورە، لە چارەسەرکردنی ئاریشەکاندا توانای پرۆژەی بچووکو مامناوەند لەو وڵاتانەدا دەرکەوت کە گرنگییان بە پرۆژەی بچووك داوە.

پرۆژە بچووکەکان بەشێوازی جیاو جۆراوجۆر پاڵپشتو چاودێریی کەرتی تایبەتو گشتی دەکەن، بەشێوەیەك (٩٠٪) دامەزراوەکانی جیهان لە پرۆژەی بچووکدا گردبوونەتەوە، (٥٠ تا ٦٠٪) هێزی کار لە جیهاندا لە پرۆژەی بچووکدا کار دەکەن، (٤٦٪) بەرهەمی ناوخۆیی جیهان بەرهەمی پرۆژەی بچووکە، بۆیە پێویستە بە هەموو شێوەیەك، حکوومەت پشتگیریی ئەو پرۆژانە بکات؛ چونکە خاوەنەکانیان ناتوانن هەمیشەو گشت کات پارەی پێویست بۆ پرۆژەکانیان دابین بکەن.

چەند تاقیکردنەوەیەکی سەرکەوتوو، دەریان خستووە کە پرۆژەی بچووك، ناوەندێکی سەرەکییە لە فراوانکردنی بنەماکانی بەرهەمهێنانو زیادکردنی هەناردەکردندا، هاوکات دابینکردنی هەلی کارە بەتایبەت لە ناوچە دوورەدەستو لادێنشینەکاندا، هاوکات پرۆژەی بچووك، هۆکارێکە بۆ گۆڕینی ناوچەی گوندنشینەکان بۆ ناوچەی پیشەسازیو درووستکردنی هاوسەنگی لە نێوان گوندو شارەکاندا، هەروەها دابینکردنی هاوسەنگی لە نێوان داهاتی نەتەوەیو سەرچاوەکانی دەوڵەتدا.

بەڵام گرنگیدان بە پرۆژەی بچووك، لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا جیاوازە لە وڵاتە دواکەوتووەکان، هەرچی وڵاتە پێشکەوتووەکانە، پرۆژەی بچووك بە جۆگەلەیەك دەبینن لە پاراوکردنی پرۆژە گەورەکاندا، بۆ نموونە: لەو دوایانەدا، لە وڵاتێکی وەك ئەمریکادا، لە کۆی (٢٣) ملیۆن کۆمپانیا (٥٨٠٠٠٠) پرۆژەی بچووك زیادی کردووە، بەڵام وڵاتە دواکەوتووەکاندا، پرۆژەی بچووك بە جۆرێك لە چارەسەری ئابووری‌و کەمکردنەوەی ڕۆڵی دەوڵەت لە وەبەرهێناندا دەبینن. بۆنموونە: لە وڵاتێکی وەك عەرەبستانی سعودیە پرۆژەی بچووك(٩٠٪)ی کۆی پرۆژەکانی وڵاتە، ئەم ژمارەیە لە میسردا دەگاتە (٩٦٪).

### هەرێمی کوردستانو پرۆژەی بچووك:

بەخاتری زۆر هۆکار، پێویستە لە هەرێمی کوردستاندا زیاتر گرنگی بە پرۆژەی بچووك بدرێتو هاوڵاتیانو حکوومەت بیری لێبکەنەوە:

١. نەبوونی پیشەسازیی گەورە، کە لە چەندین بواردا کارو وەبەرهێنان بکاتو پێداویستییە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵگا دابین بکەن.

٢. بوونی هێزی کار کە بەشێکی زۆریان دەرچووانی زانکۆو پەیمانگان.

٣. پێویستیی کۆمەڵگا بە هەموو جۆرە بەرهەمو خزمەتگوزارییەك.

٤. زیادکردنی داهاتی نەتەوەیی لە ڕێگای هەناردەکردنی بەرهەمی خۆماڵییەوە.

٥. دابینکردنی زیاد لە سەرچاوەیەکی داهات بۆ وڵات.

٦. کەمکردنەوەی ڕێژەی بێکاری‌و بێکاریی شاراوە بەتایبەت لە کەرتی گشتییدا.

نێتۆرک مارکێتینگ

## سەرکەوتن، یان شکست لە ٩٠ ڕۆژی یەکەمدا

و: ئانا هەورامی

### ستراتیژەکانی پێکهێنانی کۆمەڵەو جیاکەرەوەکانیان

خوێندنەوەی ئەم بەشە، بۆ ئەوانەی کە تامەزرۆن بەشێك لە ستراتیژەکانو ڕێکارەکانی پێکهێنانی کۆمەڵە بزاننو بۆ گەیشتن بە سەرکەوتنگەلی زیاتر، سوودیان لێ وەربگرن، پێویستە. ڕێکارگەلی زۆر بۆ درووستکردنی کۆمەڵە کە دەتوانرێت لە نێتۆرکی مارکێتینگدا بەکار بهێنرێن. من بەشێك لەم ستراتیژانە کە بە بۆچوونی خۆم ستراتیژگەلی بنەڕەتی، ئاسانو کاریگەرن، بۆ تۆی ڕوون دەکەمەوە. بە کورتی تۆش پێویستت بە چەند بنەمایەك هەیە کە بەکارهێنراوو ئەنجام بەخش بن. هیوادارم کە ئەم ڕێکارانە فێر ببیتو ئەوانەی کە بەکەڵکت دێت، بەکاریان بهێنن.

لە ژیانتدا بە دوای چ شتێکدا دەگەڕێیت؟ پرسیارێکی سادەیە، بەڵام زۆرینەی خەڵك لە ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ئەم پرسیارەدا، بێدەنگ دەبێت.جێگای داخە کە زۆرینەی خەڵك بەبێئەوەی کە بزانن ئامانجو ئارەزووەکانیان چییە، ژیان بە پایان دەگەیەنن، هەربەو شێوەیەی کە کۆنفۆشیۆس گوتویەتی: "ئەگەر هیچ ئامانجێکت بۆ نیشانەشکێنی نەبێت، بەدڵنیاییەوە تیرەکەت هەر بەر شتێك دەکەوێت." هەڵبەت زۆرجار ئەو شتەی کە تیرەکەت دەیپێکێت، بەکەڵك نایەتو بێنرخە.

یەکەم پایەی سەرکەوتن ئەوەیە، خەونگەلی گەورەت هەبێت! خەونەکان بزوێنەری پێویست بۆ بەردەوامی تامەزرۆیانەی ژیان بە ئێمە دەدەن.خەونەکان ئێمە لە ڕۆژو حاڵی ئاسایی بە "عەرشی ئەعلا"دەگەیەنن.

بۆ خۆت خەونگەلی گەورە درووست بکە. بگەڕێرەوە بۆ منداڵی! هەرچۆنێك بێت بابەتی هەبوونی خەونگەلی گەورە، "دارایی"یان لێت ناوێت.خەونەکان لە خودی خۆتدانو هیچ کەس ناتوانێت لێت بسەنن. وێنەیەکت لە خانووی خەیاڵی، یان ئەو ئۆتۆمبێلەی کە حەزت لێیەتی هەبێتو لە ژووری نووستنەکەتدا هەڵی بواسە. ڕۆژانە سەیری بکەو لە بەرامبەریدا جددی بە. گەر لە ڕێگای بەدەستهێنانی خەونەکانتدا، جدیو خاوەن بەڵێن بیت، ڕێگاکانو سەرچاوەکانی بەدیهێنانیان بەدەست دەهێنیت. تەنها کەمێك کاتی دەوێت.

هەبوونی خەونگەلی گەورە، بەرەو هەوڵدان ڕات دەکێشێت بۆ بەدەستهێنانیان. لەبەرئەوە پێویستە ئامانجەکەت دیاری بکە؛ تا پێی بگەیت. نێتۆرکی مارکێتینگ پلیکانەی گەیشتنتە بە ئامانجو ئارەزووەکانت. پێویستە ئامانجە ماوەکورتەکان، ئامانجە ماوە مامناوەندەکانو ئامانجە ماوەدرێژەکانی خۆت دیاری بکەیت. ئامانجە ماوەکورتەکان، ئەوانەن کە دەتەوێت لە ماوەی چەند ڕۆژ، یان چەند هەفتە، یان چەند مانگی ئایندە پێیان بگەیت. ئامانجە ماوە مامناوەندەکان هەتا یەك ساڵی ئایندە لەبەرچاو دەگرینو ئامانجە ماوە درێژەکانیش، هەر ئەوانەن کە دەمانەوێت دوای ساڵێك پێیان بگەین.

**لە وێناکردنی ئامانجەکانتدا پێویستە ئاگات لەم بابەتانەی خوارەوە بێت:**

**١. پێویستە ئارەزوویەکی دیاریکراوت هەبێت**

دەوڵەمەندبوون ئامانجێکی دیاریکراو نییە. پێویستە بەتەواوی بزانیت کە دەتەوێت چەند پارە پەیدا بکەیت. سەرکەوتن لە NM یشدا ئامانجێکی ئەوەندە دیاریکراو نییە. پێویستە بەتەواوی ئەو سەرکەوتنەی کە ئارەزووی پێ گەشتنی دەکەیت، دیاری بکەیت.

# ستراتیژەکانی پێکهێنانی کۆمەڵەو جیاکەرەوەکانیان



٢. پێویستە بەرواری دیاری کراوی گەیشتن بە ئامانجەکانت دیاری بکەیت.

پێنج ساڵ دواتر بەراوردێکی ورد نییە، بەڵام سیو یەکی ئابی ٢٠١٧ بەرواریکی دیاریکراوە.

٣. پێویستە لە خۆبوردووییت هەبێتو لە زۆربەی شتەکان ببووریت.

هیچ شتێك بەخۆڕایی نادەیت. بەدڵنیاییەوە پێویستە بۆ گەیشتن بە ئامانجەکەت واز لەهەندێك لە شتەکان بهێنیت. لەوانەیە پێویست بێت ئەو کاتەی کە لە سەیرکردنی تەلەفزیۆنو رابواردن، سەرفی دەکەیت، کەمی بکەیتەوە.

٤. پێویستە پێشنیارو نەخشەت هەبێت

سەرەتا بە شێوازێکی سادە دەست پێبکەو لەسەر بنەمای پێشکەوتنەکانی کارەکەت، دووبارە پێداچوونەوەی بۆ بکەو چاکسازی تێدا بکە.

٥. پێویستە لیستێکی نووسراوت هەبێت

هەمو ئەم خاڵانە لەسەر پەڕاوێکی کاغەزدا بنووسە.

٦. پێویستە رۆژانە بیخوێنیتەوە

بۆ هەرکوێیەك دەرۆیت ئەم پەڕاوە کاغەزە لەگەڵ خۆتدا ببەو رۆژانە بیخوێنەرەوە.خەونەکەت بەرجەستە بکەو بە شەوقو گەرمیو سەراپا ئومێدەوە بیکە بە وێردی سەر زارت.

هەمیشە ئارامگر بەو هەرگیز واز لە کارەکە نەهێنیت. دەتوانیت بە شێك لە بەرنامەکانت بگۆڕیت، بەڵام پێویستە هەمیشە تەرکیزت لەسەر ئامانجەکەت بێت. ئەوە بزانە کە ئامانجەکەت لەسەر کاغەز دەنووسیت، ئەو ئامانجە دەست بە هاتنە دی دەکات، ئەگەرچی کە لەوانەیە لە هەمان ئەو ساتەدا ئەوە نەبینیت. یاسای بەرزبوونەوەو راکێشان یارمەتیت دەدات.هۆکارو کەسانێك بۆ یارمەتیدانت بە ئاراستەی گەیشتن بە ئامانجەکەت، بەرەو لات رادەکێشرێن. تەنها کارێك کە پێویستە ئەنجامی بدەیت، ئەوەیە کە بە شێوازێکو بە ئەندازەیەك نووسراوەکە بخوێنیتەوەو باوەڕی پێ بکەیت، وەك ئەوەی کە هەر ئێستا پێی گەیشتوویت.بە هەرحاڵ، ئەمە مافی خۆتە وەك مرۆڤێك کە هەر ئارەزوویەك کە بتەوێت، هەبێت. ئێمە هەمووومان بە دەوڵەمەندی لە دایك دەبین!

ئەگەرچی من ئەم ناونیشانەم لەبەشی رابوردووشدا باس کرد، بەڵام پێم خۆشە دووبارە لەبارەیەوە روونکردنەوە بدەم؛ چونکە پێم وایە گەشەو سەلامەتی کۆمەڵەکەت بەستراوە بە ئەوەوە.

پێویستە بۆ کەسانی سەرووترت رێز دابنێیت. ئەم کارە زۆر گرنگە؛ چونکە توانای کاریگەربوونو دەسەڵاتیان پێ دەبەخشێت کە لە کۆمەککردنو فێرکردنو بزواندنی کۆمەڵەکەتدا بەسوودە بۆیان. ئەگەر رێز بۆ بەردەستەکانت دانەنێیت، کەسانی سەرووترت ناتوانن لە یارمەتیدانتدا، جێدەستیان دیار بێت. لەبەرئەوە، گرنگە کە هەمیشە رێز بۆ کەسانی سەرووترت دابنێیت، بەتایبەت لە کاتی ئامادەبوونی بەردەستەکانتدا. گەرچی لەوانەیە لەبارەی هەندێك بابەتەوە لەگەڵیاندا بۆچوونی جیاوازت هەبێت، بەڵام هیچ کاتێك لەبارەی ئەم رووداوە نێگەتیڤانەوە لەلای کەسانی سەرووترتدا هیچ مەڵێ. لەهەمووی گرنگتر، هیچ کاتێك گلەییو شکایەت لە کەسانی سەرووترت مەکە. ئەم بابەتەش زۆر گرنگە؛

چونکە بەردەستەکانت فێردەکەیت کە هەروەك تۆ کار بکەن. هەروەك کە پێشتریش بەبیرم خستەوە، "هەمووکەسێك ئەوە دەدوورێتەوە کە پێشتر چاندوویەتی." پێویستە هەمیشە ژێردەستەکانت هان بدەیت. تەنانەت ئەگەر ناسێنەری یەك پارچە صابوونن، پێویستە بۆ هاتنە ناوەوەی ئەندامێکت بۆ ناو کۆمەڵەکە، پیرۆزبایی لێ بکەیت. مرۆڤ بەبێ ئاو خۆراك بە زیندوویی نامێنێتەوە. پێویستە رۆژانە خواردن بە جەستەمان بگەیەنین. هەربەم شێوەیەش، پێویستە خۆراکی زهنیشمان لە رێگەی هاندانو رێزگرتنەوە فەراهەم بکەین. لەگەڵ ئەمەشدا، زۆرینەمان هیچ کاتێك بەهەرمیەك لە"خۆراك"ی هاندانو رێزگرتن نابەین. ئەگەر بتوانیت گروتینوێتی بەردەستەکانت دابمرکێنیتەوە، بەدڵنیاییەوە سەرکەوتوو دەبێتو ئەوان بەرەو لای خۆت کەمەندکێش دەکەیت. ئەگەر پێکەوە لێکتێگەیشتنو سازانتان هەبێت؛ ئەوا دەتوانن بۆ هەتایە دۆستو هاوکارانی باش بن بۆ یەکتری.

پێویستە بۆ هەر هەفتەیەكو بۆ یەکە یەکەی رۆژەکانی هەفتە بەرنامەت هەبێت. بەرنامەڕێژی بکە بە نەریت. بەپێی قسەیەکی بەناوبانگ: ("کارەکانت بەرنامەڕێژی بکەو بە بەرنامەکەت کار بکە". ("Plan your work and work your plan").

پێویستە بەرنامەکەت بریتی بێت لە ئامادەکردنی لیست، بانگهێشت، دیاریکردنی وادەی یەکتربینینەکان، بەرنامە فێرکارییەکان، ناساندنی کار، شوێنگرو شتی تر. هەمیشە پێش دەستپێکی هەر هەفتەیەك، بەرنامەی ئەو هەفتەیە رێك بخە. بەرنامەی رۆژانە هەر شەوێك پێش دەستپێکردنی ئەو رۆژە ئامادە بکە. لە کۆتایی رۆژ، یان هەفتەدا، پێداچوونەوە بکە، کە چ کارێکت ئەنجام داوە. ئەو بەرنامانەی کە نەتکردوون بە پراکتیکی، هەڵیان بگرە بۆ رۆژی دواترو دەبێت ئەنجامیان بدەیت. هەروەها لە بیرت بێت کە ریزبەندی لە کارەکانتدا بکەیت. سەرەتا ئەو کارانەی کە گرنگییەکی زیاتریان هەیە، ئەنجامیان بدەو لە بەرنامە رێژییەکەدا بەدوای پێشکەوتنەوە بە.

کاری تۆ، لە نێتۆرکی مارکێتینگدا، دروستکردنی کۆمەڵەیەکی گەورە دەبێت. ئەو کاتەی کە کۆمەڵەکە بچووك بێت، دەتوانیت ئامادەیی فیزیکیتان هەبێتو بۆ خۆت یارمەتیی ئەندامانی کۆمەڵەکەت بدەیت، بەڵام ئەو کاتەی کە کۆمەڵەکەت زیاد لەڕادە گەشە بکات، ئیتر ئامادەبوونت لە هەموو جێیەکدا دەست نادات. هەروەك سوپا کە جەنەراڵ پێویستی بەهاوکاری هەموو فەرماندەکانی هەیە، لە NM یشدا پێویستت بە یارمەتیی هەموو پێشەنگەکانی کۆمەڵەکەت هەیە. ئەوان بە فێرکردنی کەسانی ترو ئەنجامدانی چالاکی هاوشێوەسازی کۆمەك دەکەن. هەربەم هۆیەوە، هەبوونی پەیوەندیی باش لەگەڵ ئەواندا، زۆر گرنگە. فێرکردنو هاوشێوەسازی، بابەتی روونو بەجێ، بۆ ئەوانیش زۆر گرنگە.

بەشێوەیەکی رێکخراو لەگەڵ "فەرماندەکانی"خۆتدا چاوپێکەوتنگەلێك رێك بخەنو لەبارەی پێشنیارەکانتو شێوەکانی پێشکەوتنی کار لەگەڵ ئەواندا باس بکەو را بگۆڕنەوە. ئەم کۆبوونەوانە بەوردی بەڕێوە ببەو پێگەیەك بۆ هەموان دابین بکە. زۆرجار چاوپێکەوتنی نافەرمیت لەگەڵ کەسانی سەرووترتدا هەبێت، بۆ نموونە: بۆ خواردنەوەی چا، یان قاوە.

# پادشای چاکەخواز

ئا. لەكرمانجییەوە: محەمەد مێرگەیی



بۆ شازادەیەك لەباوكییەوە، میراتێكی مەزن بەجێ مابوو. ئەو شازادە كەسێكی گەلێك بەڕەحمو بەزەییو چاك بوو، هەر لەبەر ئەو چاكییو باشییەی شازادەش بوو، گەلو هاوڵاتیانی مەملەكەتەكەی، زۆر خۆشیان دەویست. پاش ئەوەی پادشای وڵات چووبووە بەر ڕەحمەتو دلۆڤانی خودای پەوەردگارو كۆچی دوایی كردبوو، شازادەی كوڕی، هاتبووە سەر تەختی فەرمانڕەوایی. شازادە هەر كە بووبووە پادشای وڵات، بەر لە هەر شتێك، باجی قورسی لەسەر میللەتو خەڵكی مەملەكەتەكەی لاداو زیاتر بایەخی بە ژیانی خەڵكو لەشكرەكەی دا.

بەڵام لەولاوە كەسێك هەبوو خۆشیی نەدەهات بەو ڕەوشە باشو خۆشحاڵییەی گەلو بەوە زۆر دڵتەنگ دەبوو! ئەو كەسە وەزیری پێشوو بوو، دڵتەنگییەكەی تا ئەو ئەندازەبوو، كە لە دواییدا چیتر خۆی پێ نەگیرا هەتا چووە لای پادشاو پێی گوت: تۆ كارێكی باش ناكەیت، بۆچی میراتێك كە باوكت بۆتی جێهشتووە، وەها بەو شێوە بەناو گەلدا پەرتو بڵاوی دەكەیت!؟ خۆ ئەم میراتە بە تەنها پشكی باوكی تۆ نییە، ئەوە بەشو ڕەنجی هەموو پادشایانی پێشووتریشە. ئەم گەنجینەیەی دەوڵەت بۆچی دانراوە! ئەوە بۆ كاری گرنگو ڕۆژانی تەنگانەیە.

وەزیری پێشوو بەردەوام بوو لە قسەكانیو گوتی: من تكات لێدەكەم، ئەم خەزنە بەنرخو گرانبەهایە وەها بڵاو نەكەیتەوە. لەوانەیە لەناكاو دەوڵەتێكی دراوسێ هێرش بكاتە سەرمانو ڕەوشێكی خراپمان بەسەردابێت!

پادشای لاو بەو قسانەی وەزیر گەلەك زویرو عاجزبوو، چاوو برۆی كەوتنە ناو یەكو بە ڕوویەكی گرژەوە پێی گوت: خودای بەدیهێنەری شەوو ڕۆژان، منی كردە خاوەنی ئەو هەبوونەو ئەو دەوڵەتە. بە باوەڕی من دەبێ هاریكاریی هەژارو نەدارو بێكەسان بكەم، من ناخوازم پاسەوانی لەو خەزێنەیە بكەم.

وەزیر كە دیتی هیچ شتێكی بەدەست نەكەوت، بەناچاری داوای لێبووردنی كرد. قاروون دونیای جێ هێشتو ناوی بە خراپ دەهێنرێت. ئەو كەسەی لە پاش خۆی ناوێكی باش بەجێ بهێڵێ، ئەوە كەسێكی بەختەوەرە. دەبێ مرۆڤ لە ژیانی خۆیدا هەردەم حسێبی باشیو چاكەو نەباشیی بكات.

سەرچاوە: Bostan û gulistan



# بەکارهێنانی دەرمان

ن: د. حسان شمسی پاشا
و: یەحیا محەممەد عەلی

**یەکەم: هەڵە باوەکان لە بەکارهێنانی دەرمانداا:**

هەندێك جـار هەڵەبەکارهێنانی دەرمان، دەبێتە هۆی ئەوەی پێچەوانـەی ڕۆڵـی خۆی ببینێتو زیانی مەترسـیدار درووسـت بکاتو تەنانەت ڕەنگە سەر بکێشێت بۆ مردن! لەو هەڵە باوانە:

١. بەکارهێنانی دەرمانی کەسـێکی دی، بەبێ ڕاوێژکردن بە پزیشك، بەبیانووی ئەوەی ئەمیش بەدەست هەمان کێشەوە دەناڵێنێت.

٢. کاتێك دەچێتە لای پزیشـك، بە وردیی باسـی نەخۆشییە کۆنەکانیو ئەو دەرمانانە ناکات کە پێشتر بەکاری هێناون.

٣. خراپ هەلگرتنی دەرمانەکان: وەك هەلگرتنیان "لەبەر تیشکی خۆر، شـوێنی شـێدار، شـوێنی ڕووناك، لە شـوێنێکی زۆر سارد"دا، یاخود تێکەڵکردنو هەلگرتنی چەند دەرمانێك لە یەك دەفردا.

٤. وەرگرتـنو بەکارهێنانی دەرمانی هەموو شـوێنێك، بەبێ گوێدان بە باوەڕپێکراویو کوالێتیی دەرمانەکان.

٥. وەرنەگرتنی زانیاری تەواو لە پزیشـك، لەبارەی "شـێوازو چۆنێتـی، بـڕ، کات"ی بەکارهێنانـی دەرمانەکە، لەگـەڵ "زیانە لاوەکییەکانو کاریگەریی لەگەڵ دەرمانەکانی تر".

٦. پابەندنەبـوون بـەو کاتـەی پزیشـك دیـاری دەکات بـۆ بەکارهێنانی دەرمانەکان.

٧. لەخۆوەگۆڕینو کەمو زیادکردن لە بڕو کاتی بەکارهێنانی دەرمان.

٨. هەڵەکـردن لە ڕێـگای بەکارهێنان، بـۆ نموونە: "کرێمی پێست، وەك قەترە بکەیتە چاوەوە".

٩. بەکارهێنانـی دەرمانـی کەسـی گـەورە بۆ بچـووك، یان بەپێچەوانەوە، بەبێ ڕاوێژکردن بە پزیشك.

١٠. بەبێئەوەی پێویست بکات، بەکارهێنانی دژەزیندەوەرەکان ((scitoibitnA" لە ژمارەی داهاتوو باسی دەکەین".

١١. دەرمان دەستی منداڵی پێ بگات!

١٢. واز لە کەسـانی پیر بهێنرێت، خۆیان دەرمانەکانی خۆیان بـەکار بهێنن، ئەمەش زۆرجار کێشـە درووسـت دەکات، بەهۆی لەبیرچوونەوەو چاوکزبوونو تێکەڵکردنی دەرمانەکان.

١٣. هەلگرتنی کۆمەڵێك دەرمانو هێشتنەوەیان بۆ کاتێکی زۆرو لەخۆوە بەکارهێنانەوەی لە کاتی تردا، بەبێ ڕاوێژ بە پزیشك.

١٤. بەکارهێنانـی ئـەو دەرمانانەی شـلن، پـاش مانگێك لە هەڵدانەوەی قەباخەکەی.

١٥. بەکارهێنانی دەرمان لە تاریکیدا، کە دەبێتە هۆی ڕوودانی هەڵە.

١٦. بەکارهێنانی دەرمان پاش کەوتنە سەر زەوی.

١٧. بەکارهێنانـی دەرمان لەگەڵ چارەسـەری ڕووەکی، بەبێ پرسی پزیشك" هەردووکیان دەرمانن، کار لەیەك دەکەن!".

١٨. کەمتەرخەمیکردن لە بەکارهێنانی دەرمان لە کاتی سەفەردا.

**٢.ئامۆژگارییە پێویستەکان:**

١. پێویستە پزیشکەکەت ئاگاداربکەیتەوە لەمانە:

- لە ئێستادا هەر دەرمانێکی تر بەکار دەهێنیت، لەبەرئەوەی هەندێك دەرمان هەیە کاریگەریی خراپیان لەسەر یەکتر هەیە.
- پێشتر هیچ گرفتێکت لە بەکارهێنانی دەرمان هەبووە؟
- ئەگەر ئافرەتێك" دووگیان بێت، یان شیر بداتە کۆرپەکەی"
- بوونی هەر نەخۆشییەکی درێژخایەن (شەکرە،...).
- کارو پیشەکەت" بۆ نموونە هەندێك دەرمان هەیە، کەسەکە گێژ دەکات، بۆ کەسی شۆفێر نابێت".
- توانای دەستخستنی دەرمانەکە.

٢. ڕەچەتـەی دەرمانەکە زۆر بە وردی بخوێنەرەوەو زانیاریی تەواوی لەسەر وەربگرە.

٣. زانیاریی تەواو وەربگرە لەبارەی "شێوازو چۆنێتی، بڕ، کات "ی بەکارهێنانی دەرمانەکە.

٤. هەرگیـز لەخۆتـەوە بەکارهێنانی دەرمانەکە مەوەسـتێنە، بەبیانووی ئەوەی باش بوویتو نیشانەکانی نەخۆشییەکەت نەماوە.

٥. بەهـۆی ئەو دەرمانـەوە، هەر گۆڕانکارییەکـت لە خۆتدا بەدی کرد، بە پزیشکەکەت ڕابگەیەنە.

٦. هەرگیـز دەرمان بۆ ماوەیەکی زۆر هەڵمەگرە، دواتر بەبێ پرسی پزیشك بەکاری مەهێنەرەوە.

٧. لە شوێنی وشكو تاریكو کەمێك ساردا هەڵیان بگرە.

٨. هەرگیز پاکەتی دەرمانەکان فڕێ مەدە.

٩. هەرکات لەیادت چـوو دەرمانێك بەکار بهێنیت، گەر کاتی زۆر بەسـەر وادەی خۆیدا تێپەڕ نەبووبوو؛ ئەوا یەکسەر بەکاری بهێنـە، گەر هێنـدەش دواکەوتبوو نزیك بووبوویـەوە لە وادەی داهاتـووی بەکارهێنانی دەرمانەکـە؛ ئەوا چاوەڕێ بکە؛ تا وادەی خۆی دێت، لە کاتی خۆیدا بەکاری بهێنەو دوو هێندەی مەکە!

# بۆئەوەی جەستەت بەرگرییەکی بەهێزی هەبێت!

بەشی دووەم

لە بەشـی یەکەمی بابەتی "؛بۆئەوەی جەستەت بەرگرییەکی بەهێزی هەبێت" باسمان لە چەند خۆراکێك کرد کە دەبێتە هۆی بەدەسـتهێنانی بەرگرییەکـی بەهێز، لە بەشـی دووەمیدا چەند خۆراکێکی بەسوودی تر بۆ بەرگری دەخەینە بەردەست ئەوانیش؛

١. شۆربای مریشك..

توێژەرانی زانکۆی نبراسکای ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دۆزینەوەیەکی گرنگیان ڕاگەیاند سەبارەت بە شۆربای مریشك، بەپێی توێژینەوەکـە ئەو شـۆربایە، ڕێ لە هەوکردنـی خانەکان دەگرێت، ئـەم دۆزینەوەیە زۆر گرنگە لە کاتێکدا نیشـانەکانی سـەرمابوون لە ئەنجامی کەڵەکەبوونی خڕۆکە سـپییەکان لە سیکڵدانۆچکەکاندا دەست بە دەرکەوتن دەکەن‌و ترشی ئەمینی "سیستین" ئەو مادەیەیە کە لە کاتی لێنانی مریشـکدا دەردەدرێت‌و چارەسـەری هەوکردنی سـیکڵدانۆچکەکان دەکات، هەروەها ئەم ترشە ئەمینییە هاوشێوەی حەبی "ئەستیل سیستاینە، لەبەر ئەوە شۆربای مریشك گرنگترینی ئەو خواردنەیـە کە بەرگری بەهێز دەکات‌و باش وایە ئەو کاتانەی هەست بە نەخۆشییەکانی سەرمابوون کرا بخورێت.

٢. گۆشتی مانگا..

توتیـا یەکێکە لـەو توخمانەی بە ڕێژەیەکی کەم لە لەشـی مرۆڤـدا هەیـە، بەتایبەتی ئەوانـەی کەم گۆشـت دەخۆن، یان هەر نایخۆن، گۆشـت بە سـەرچاوەی یەکەمی توتیـا دادەنرێت، کەمـی توتیا یاریدەرە بۆ زۆربوونی مەترسـی پەتا؛ چونکە کار لەسـەر چالاکی خڕۆکە سپییەکان دەکات. توتیا بێجگە لە گۆشت سەرچاوەی تری هەیە وەك ماست‌و مریشك.

٣. پەتاتەی شیرین

لەوانەیە هێندەی بەش‌و ئەندامەکانی تری لەش هەسـت بە گرنگیی پێسـت نەکرێت، لە کاتێکدا پێسـت بـە هێڵی یەکەمی پارێزەری لەش لە ڤایرۆس‌و بەکتریا دادەنرێت، پێسـت پێویستی بـە ڤیتامیـن ئەی هەیە؛ بۆئـەوەی بە تەندرووسـتییەکی باش بمێنێتـەوە، دەیڤد کاتز بەڕێوەبەری سـەنتەری "یل جریفین"ی تایبـەت بـە توێژینەوەکانـی خۆپاراسـتن دەڵێـت: باشـترین سـەرچاوەی ڤیتامیـن ئـەی پەتاتەی شـیرینە، ئـەم بەرهەمە دەوڵەمەنـدە بە بیتاکارۆتین‌و لە لەشـدا دەگۆڕێـت بۆ ڤیتامین ئەی. چەند خواردنێکی تریش دەوڵەمەندن بە بیتاکارۆتین وەك گێزەرو کوولەکەو شەمام‌و کوولەکەی سوور.

٤. ڤارچکی ناسراو بە هێلانەی قەلەڕەش..

لـە دێریـن زەمانـەوە خەڵـك ڤارچکـی وەك خواردنێکـی تەندرووسـت بۆ بەرگری لەو نەخۆشـییانەی تووشی لەشی مرۆڤ دەبـن بـەکار هێنـاوە، زانایانیش لە ئێسـتەدا هـۆکاری ئەوەیان دۆزیوەتەوە چۆن ئەم کەڕووە بەرگری لەش بەهێز دەکات، "دکتۆر دۆگلاس سـکار" بەڕێوەبەری پەیمانگەی زانستی گیایی لە واشنتن لە ڕێی توێژینەوەکانەوە جەخت لەوە دەکاتەوە، ئەم جۆرە کەڕووە یارمەتیـی بەرهەمهاتـن‌و چالاکبوونی خڕۆکە سـپییەکانی خوێن دەدات، بە جۆرێك وایان لێ دەکات زۆر توند بن دژی نەخۆشییەکان، بێگومان ئەمەش بۆ بەهێزبوونی بەرگریی لەش بەسوودە.

٥. مێوی هەنگ

مێوی هەنـگ بە یەکێك لەو خواردنانە دادەنرێت کە زۆرترین بـڕی دژەمیکرۆبەکانـی تێدایـەو دەوڵەمەندە بە ترشـەکانی دژە ئۆکسـیدی وەك ترشـی کافییـك‌و ئەبینجین، ئەم ترشـانە چەند ئاوێتەیەکن وەڵام دەرەوەیەکی باشن بۆ بەهێزبوونی بەرگریی لەش.

س: پێگەی فوائد







# ئایا دەتەوێت بگەیتە لوتکە؟

ئێمە هەمیشە لە جیهانی خەیاڵدا مەلە دەکەین، خەون بە سەرکەوتنو گەیشتن بە لوتکەو هیواو ئاواتەکانمانەوە دەبینین؛ چونکە سەرکەوتن ئەو شتەیە، کە هەمووان ئاواتی بۆ دەخوازینو هەوڵی بۆ دەدەین، بەڵام دەبێت بزانین سەرکەوتن تەنها بە ئاواتخواستن بەدەست نایەت، بەڵکو پێویستی بە هەوڵدانو تێکۆشانو شەونخوونی هەیە.

مرۆڤەکان کاتێك لەدایك دەبن، لەگەڵیاندا هیواو ئاواتو تواناو شارەزایی لەدایك دەبێت، ئەوەی پێویستە لەسەر مرۆڤ ئەوەیە کە هەموو ئەوانە ڕێك بخاتو پەرەیان پێ بداتو بە پەیژەی سەرکەوتندا سەربکەوێتو هەوڵی بەردەوام بدات، بۆ گەیشتن بە لوتکە، بەڵام کەسانێك هەن تواناو شارەزاییو هیواکانیان دەمرێنن، هەندێکیان بە هۆی ئەوەی هۆکارەکان نادۆزنەوە؛ تا بیانگەیەنێتە لوتکە، هەندێکیش بە هۆی ئەوەی بەردەوام لە نێو خەونو ئاواتو خۆزگەدا دەژین، بەبێ بیرکردنەوەو هەوڵدانو کارکردن بۆ بەدیهێنانی ئاواتەکانیان.

کەواتە: پێویستە هەموان هەوڵ بدەینو خۆمان ماندوو بکەین، کاربکەین، تواناکانمان یەك بخەین؛ بۆئەوەی بەرەو پێشەوەو بەرەو سەرکەوتن بڕۆین.

ژیان چ مانایەکی هەیە، ئەگەر مرۆڤ نەیزانی چۆن کاتەکانی بەڕێوە ببات، ئەگەر مرۆڤ نەیزانی پلانی سەرکەوتن دابنێت، مرۆڤ چۆن سەر دەکەوێت ئەگەر کار بەم بنەمایە نەکات:

(ژیان زانستو کارکردنە)!

کەواتە: بۆئەوەی بزانیت تۆ یەکێکی لەو کەسانەی کە لە کارو پڕۆژەکانتدا سەرکەوتوویت؛ ئەوا ڕاشکاوانە وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەرەوە:

١- کاتێك پرۆسەی خوێندن دەست پێ دەکات، چۆن پێشوازی لێ دەکەیت؟

أ- بەتەواوی پێداویستییەکانەوەو بەوپەڕی گەشبینییەوە بەرەو سەرکەوتن خۆت ئامادە دەکەیتو پێشوازی لێ دەکەیت.

ب- چارەیەك نییە، ئەوە کارێکەو پێویستە پێوەی پابەندبیت.

ج- حەزت بە گەڕانەوەیە بۆ پشووەکان.

٢- ئەگەر ڕاسپێردرایت بۆ کارکردن لە بڵاوکراوەیەکدا، یان بۆ ئامادەکردنی برۆشەرێك، تایبەت بە قوتابخانە، یان زانکۆ، ئەوە چەندەمین کاری تۆیە؟

أ- ئەوە یەکەم کارو یەکەم بەرهەمتە.

ب- ئەوە کاری دووەم، یان سێیەمتە، دوای ئەزموونێك لە فوتابخانە.

ج- تۆ ڕاهاتوویت لەسەر ئەو کارانەو ئەنجامدانی ئەم کارەشت، دەچێتە سەر ئەزموونی کارەکانی دیکەت.

٣- کاتێك خوێندن دەستی پێ کرد، بە هەوڵدانو ڕێکخستنی کاتەکانت، وەڵامدانەوەت بۆ گۆڕانکارییەکان چۆنە؟

أ- هەر لەسەرەتاوە خۆت ئامادە دەکەیت.

ب- لە سەرەتاوە زۆر گرنگی پێ نادەیت، بەڵکو تاڕادەیەك ڕفیشت لێیەتی. ج- لەسەرەتادا هەست بە جۆرێك لە نامۆیی دەکەیت، بەڵام هەر زوو لەگەڵیدا ڕادێیت.

٤- هەموو بەیانییەك کاتی هەستانت بۆ خۆئامادەکردنو ڕۆیشتنت بۆ زانکۆ، یان بۆ فوتابخانە، هەست بەچی دەکەیت؟

أ- هەست بە گرنگی پێدانو گرۆتینێك دەکەیت، خەون بە سوپرایزێکی بچووکی ئەرێنییەوە دەبینیت.

ب- هەست بە هیچ پەرۆشییەك ناکەیت، بەڵام ناچاری دەبێت هەستیت بە جێبەجێکردنی ئەرکەکانت.

ج- هەست بە خۆشیو چێژێك دەکەیت، بەڵام هەستە نەرێنییەکانت دەتگریەنن.

٥- چۆن وەسفی خۆت دەکەیت، لە ماوەی بەسەربردنی کاتژمێرەکانی ڕۆژدا؟

أ- بە چالاکیو گورجو گۆڵی.

ب- حەز بەفێربوونی تواناو هەوڵەکانت ناکەیت.

ج- دەتوانیت بەشداری بکەیت لە چەند بوارێکی دیاریکراودا.

٦- ئایا ئەو بیرۆکەو بۆچوونانەی بەرپرسەکانت پێشکەشتی دەکەن، بە گرنگییەوە وەری دەگریتو هەوڵی جێبەجێکردنیان دەدەیت؟

أ- هەندێجار. ب- زۆربەی جار. ج- هەرگیز.

٧- ئەو ڕۆژەی پشووەو تۆش لە بەسەربردنی کاتەکانی پشوودایت، چۆن دەڕوانیت بۆ ئەو ڕۆژەی دەگەڕێیتەوە بۆ خوێندن، یان بۆ کارەکەت؟

أ- ڕۆژێکی بێزارکەر. ب- هیچ گرفتێك نییە ڕۆژێکی ئاساییە.

ج- ڕۆژێکی زۆر جوانو نایابە.

٨- ئەگەر مۆڵەتت پێ بدرێت بۆ گۆڕانکاریو ڕێکخستنی ناوماڵ، پەرچەکردارت چۆن دەبێت؟

أ- سەبارەت بەو بابەتە لێکۆڵینەوە دەکەیت، هاوکات پێشوازی دەکەیت لە ڕاوبۆچوونی کەسانی دەوروبەرت.

ب- ئەو هەڵە دەقۆزیتەوە بەبێ دوودڵی.

ج- فەرمانەکە ڕەت دەکەیتەوە.

ئەنجام:

ئەگەر کۆی خاڵەکانت لە نێوان «١٨-٢٤» خاڵدا بوو.

ئەوا بە دڵنیاییەوە تۆ کەسێکی بە سەرکەوتن دەگەیت، هاوکات کەسێکی بەختیارو ئاسوودەیت، بەڵام دەبێت بزانیت کە چۆن پارێزگاری لە خۆت دەکەیت، کە هەمیشە لە لوتکەدا بمێنیتەوە.

سەرکەوتنو گەیشتن بە لوتکە، بە تەممەڵیو ئاواتخواستنو خەیاڵ بەدەست نایەت، بەڵکو بە هەوڵدانو تێکۆشانو شەونخوونی، مرۆڤ بەو ئامانجانە دەگات کە پلانی بۆ داناون، هاوکات پێویستە ئارام بگرین لەسەر ئەو تەنگژەو نارەحەتیانەی کە لە ڕێگەی سەرکەوتندا دووچارمان دەبن، ئاگاداربە هەرگیز کارەکانت دوا مەخە؛ چونکە کات کورتەو تێدەپەڕێت، کارەکانیش زۆرن، ئەگەر کەڵەکە بن بەسەرتەوە؛ ئەوا ناتوانیت ئەنجامیان بدەیت، ئەوەش پێی دەگوترێت سەرەتای شکست. ئەم پەندە جێبەجێ بکە، کاری ئەمڕۆ مەخەرە سبەی.

ئەگەر کۆی خاڵەکانت لە نێوان «١٠ - ١٧» خاڵ بوو:

لەم بارەشدا تۆ بە کەسێکی سەرکەوتوو ئەژمار دەکرێیت، بەڵام پێویستت بە ڕێکخستنی کاروبارەکانت هەیە؛ تا لە سەرکەوتنێك زیاتر سوود وەربگریت، ئەویش لە ڕێگای بیرۆکەی ئەرێنی، وەرزشکردن، پێداچوونەوە بە ئامانجەکانتدا، پاداشتکردنی خود، پیادەکردنی لێهاتوویی فێربوونو دەستپێشخەری لە پێشنیارکردنی بیرۆکەی نوێ، گفتوگۆکردنو ڕاگۆڕینەوە لەگەڵ هاوکارانت، ئەنجامدانی توێژینەوەی زانستی، لە بوارێکدا کە دەتگەیەننە لوتکەی سەرکەوتن.

ئەگەر کۆی خاڵەکانت لە نێوان «٠-٩» بوو:

ئەوا تۆ نەتتوانیوە لە ژیاندا سەرکەوتنی پێویست بەدەست بهێنیت، پێویستە بە دوای چارەسەردا بگەڕێیت، چارەسەرێك کە بتگەیەنێت بە ڕێبازو لوتکەی سەرکەوتن.. دەتوانیت بۆ ئەم مەبەستە ئەم خاڵانە پیادە بکەیت:

- کاتەکانت ڕێك بخە.
- بە تەرکیزەوە بخوێنەرەوە.
- وەرەدانەبەرخۆو هاندان زیاد بکە.
- بیر بکەرەوە.
- هەوڵ بدە ترس لە ئەنجامدانی کارەکانت کەم بکەیتەوە!

| پرسیار | أ | ب | ج |
|---|---|---|---|
| ١ | ٣ | ٠ | ١ |
| ٢ | ٠ | ٢ | ٣ |
| ٣ | ٣ | ٠ | ٢ |
| ٤ | ٣ | ٢ | ٠ |
| ٥ | ٣ | ٠ | ١ |
| ٦ | ٢ | ٣ | ٠ |
| ٧ | ٠ | ١ | ٣ |
| ٨ | ٣ | ٢ | ٠ |

و: چیمەن لەتیف




# یاخی بە، بەرامبەر بە شکست!

پێویستە پێکهاتەی هۆشی مرۆڤ، بەگوێرەی ئاواتەکانی بێت، بەگوێرەی هیواکانمان پلان دابڕێژین، ئەوە عاقڵی نییە، کەسێك هیوای گەورەی لە ژیاندا هەبێتو بەشێوەیەکی ئاسایی ژیان بەڕێ بکات، کاتەکانی لێ دێتەوە یەك بێئەوەی وەبەرهێنانی تێدا بکات، هزری خاڵییە بێئەوەی شتێك جێگای بایەخی بێت، ژیانی دەبێت بە ئاژاوە.

هەروەها پێویستە ئادەمیزاد لە ئاستی بیرکردنەوەدا لە بواری پلاندانانو تێڕوانین بۆ دوارۆژدا خاوەن ئامانجی گەورە بێت، خۆی بگونجێنێت لەگەڵ ئەو ماندوبوونو ئاستەنگانەی کە هاوتای بەئامانجو تێڕوانینەکانێتی.

گرنگترین، توندترینو قورسترین ئەو ئاستەنگانە بریتین لە ڕەخنەی ناڕەوا، ڕەخنەی ستەمکارانە، ئەو لۆمەیەیە کەسێك بەرانبەرت دەیکاتو گەرەکێتی بە لێدانێکی توند تەختت بکات، بەشێوەیەك هەرگیز ڕاست نەبیتەوە.

هەرکات ئەم جۆرە لۆمە، گومانو گاڵتەپێکردنەت بینی، پێبکەنە، بەڵی پێویستە هیچ کەس لە ئێمە شیکایەت نەکات لە ڕمی ئەو ڕەخنانەی ئاڕاستەی دەکرێت، ئەو قەڵبانەی سەرەڕمی لۆمەو گازندەکان لە جەستەودەروونی دەکەن نەناڵێنێت، بەتایبەت لە پێناو ڕێگای سەرفرازیو باڵادەستیدا، سەرکەوتن بۆ هەندێ کەس جێگای گاڵتە پێکردنە، بەتایبەت دەروونلاوازەکان، کەسی وایان تێدایە، بەدەم بیرکردنەوەوە شەو دەدەنە دەم ڕۆژ، تەنها لە پێناو ئەوەی ڕێگایەك بدۆزنەوە بۆ تێکشاندنت.

ئەمەت پێ دەڵێم، دەمەوێت ڕاستییەکت بۆ ڕوون بکەمەوە؛ چونکە ماوەیەکی زۆری ویست؛ تا تێیگەیشتم، دەبێ بزانیت بەگوێرەی خۆت ڕەخنەت لێدەگیرێت وەك دەڵێن: (کاڵا لە گوێرەی باڵایە)، نابێت سەر لە خۆمان بشێوێنین لا بکەینەوەو لەبارەی هۆکارەکانی لۆمەی ناڕەوا بپرسین.

زۆر بەسادەیی هاوڕێ، بۆیە بەو شێوەیە مامەڵەت لەگەڵدا دەکرێت؛ چونکە تۆ ڕێگایەکی گرانت هەڵبژاردووە، بڕیارت داوە لەوانی تر بڵندتر بیت، کاتێك یەکێکیان تۆ بەسەرسەری خۆیەوە دەبینێت دەشڵەژێت، پلارێکت تێدەگرێت؛ بۆئەوەی بتگەڕێنێتەوە سەر زەویو یەکسانت بکات بەخۆیو هاوتاکانی، یاخود بە ناخی زەویدا بتباتە خوارێ.

چارەسەر بەسەر ناڕەحەتییەکاندا سەرکەوەو لە شەقەی باڵ بدە، ئەگەر شۆخییان پێ کردیت، کارەکانت باشتر ڕاببەڕێنە، هەوڵ بدە بەباشترینو جوانترینو تەواوترین شێوە کارەکانت پیشان بدەیت.

ئەگەر ڕەخنەیەکت خوێندەوە، یان لۆمەیەکت بیست، بەشێوەی ناشیاو نووسرابوو، یان ئاڕاستەت کرابوو، لەسەرخۆ دەم پانەوەکەو پێبکەنە، تووڕەبوونەکەت، ئازارەکەو دڵتەنگییەکەت وەشێرە، داوا لە پەروەردگار بکەو بپاڕێرەوە لە تۆو ئەوکەسەش ببورێتو ڕێنماییتان بکات، کە بە ناڕەوا لۆمەی کردوویت.

تەنها بەم شێوەیە دەتوانم دڵنیات بکەمەوە، کە تووشی کێشە نابیت.

مافی خۆیەتی ڕەخنە بگرێت، ئەوەی خاوەنی بەزەییە با یارمەتیدەر بێت (ئەبراهام لنکۆڵن)




# فیراسەتی هەیاسی خاس

هەیاس جگە لە زیرەکیو لێهاتوویی‌و بە توانایی لە قەزاوەتدا، کەسێکی سەرناس‌و خاوەن زانستی فیراسەت بووە، بە جۆرێك بە سەیرکردنی کەسی بەرامبەر بێئەوەی یەك جاریش لەوەو پێش بینیبێتی، دەیزانی ئەو کەسە چییەو چ کارەیە، لە بابەتی ئەم جارەماندا، چەند نموونەیەك لەبارەی زانستی فیراسەتی هەیاسی خاسەوە باس دەکەین؛ تا بزانین هەیاس چەندە سەرناس‌و خاوەن فیراسەت بووە..

* جارێکیان چوار ئافرەت پێکەوە ڕوو دەکەنە دادگاکەی هەیاسی خاس، کاتێك هەیاس دەیانبینێت، دەڵێت: یەکەمیان ئافرەتێکی دووگیانە، دووەمیان شیردەرە، واتە: تازە منداڵی بووەو شیری خۆی بە منداڵەکەی دەدات، سێیەمیان بێوەژنە، چوارەمیان کچە! کاتێك لەم بۆچوونەی هەیاسیان کۆڵییەوە، زانیان کە درووست بەو شێوەیە کە هەیاس گوتویەتی!

پێیان گوت: قوربان چۆن ئەوانەت زانی؟

هەیاس لە وەڵامدا گوتی: ئافرەتی یەکەم کاتێك قسەی لەگەڵدا کردم جلەکانی بەرز کردەوە، بەوەدا زانیم کە دوگیانە، ئافرەتی دووەم کاتێك قسەی لەگەڵدا کردم، دەستی بە مەمکییەوە گرت، بەوەدا زانیم کە ئافرەتێکی شیردەرە، ئافرەتی سێیەم کاتێك هاتە ژوورەوە، سەیری ئەملاو لای کردو چاوەکانی دەگێڕا، کاتێکیش قسەی لەگەڵدا کردم چاوی بڕی بووە چاوم، بەوەدا زانیم کە بێوەژنە. ئافرەتی چوارەم کاتێك هاتە ژوورەوە ئاوڕی بۆ هیچ لایەك نەدایەوەو سەیری کەسی نەکرد، ڕاستەوخۆ دانیشت، کاتێکیش قسەی لەگەڵدا کردم، سەیری زەوییەکەی دەکرد، بەوەدا زانیم کە کچە!

* ئیبن عەساکر دەڵێت: ڕۆژێکیان هەیاسی خاس لەگەڵ هاوەڵانیدا بە ڕێگەدا دەڕۆیشت، بە تەنیشت ماڵێکدا تێپەڕین، لە نێو ماڵەکەوە گوێی لە دەنگی ئافرەتێك بوو، هەیاس گوتی: ئەو ئافرەتە دووگیانە! هەر ئەوەش نا، بەڵکو گوتی: ئەگەر منداڵی بوو منداڵەکەیان بە ویستی خودا کوڕ دەبێت!

گوتیان: قوربان چۆن دەزانیت؟

هەیاس گوتی: گوێم لە دەنگی بوو، کە بەهەناسەوە قسەی دەکرد هەناسەی هەڵدەکێشایەوە، بەوەدا زانیم کە ئەو ئافرەتە سکی هەیە! هەروەها دەنگی کزبوو، بەوەدا زانیم کە منداڵەکەی کوڕە!

* ڕۆژگار تێپەڕی، جارێکیان هەیاس‌و هاوەڵەکانی بەلای هەندێك دوکاندا تێپەڕین، لە یەکێك لە دووکانەکان کوڕێکی هەرزەکاری بینی، هەیاس گوتی: ئەگەر من شتێك بزانم، دەزانم ئەم کوڕە هی ئەو ئافرەتەیە، کە ئەو جارە گوتمان ئافرەتەکە دووگیانەو گەر منداڵی بوو منداڵەکەی کوڕ دەبێت! کاتێك سۆراغیان کرد، بۆیان دەرکەوت کە ئەو کوڕە کوڕی هەمان ئافرەتە!

* جارێکیان هەیاس کۆمەڵێك دەبینێت خورما دەخۆن، ناوکی خورماکان بەملاولادا فڕێ دەدەن، دەبینێت کە مێش لە لایەکی خورماکە ئاڵاون‌و نزیکی لاکەی دیکە ناکەون.. هەیاس دەڵێت: لەو جێگەیەدا مارێکی لێیە.. کاتێك خەڵکەکە دەچنە شوێنەکەو بە وردی دەگەڕێن، مارەکە دەبینن‌و دەیکوژن..

دەگەڕێنەوە بۆ لای هەیاس‌و پێی دەڵێن: چۆن زانیت لەو جێگەیەدا مارێك هەیە؟

هەیاس دەڵێت: سەرنجی مێشەکانم دا نزیکی ئەو جێگەیە نەدەکەوتن، هەرچەندە وەکو لایەکەی دیکە خورمای لێ بوو، بەوە زانیم کە مێشەکان بۆنی ژەهری مار دەکەن، بۆیە نزیکی ئەو جێگەیە ناکەونەوە، بەو شێوەیە زانیم کە ئەو جێگەیە ماری لێیە!

www.al-eman.com



# ئێمەو ئەزموون

زاهیر زانا

ئەزموون پێویستییەکی گەشەکردنی ژیانەو ڕێگای خۆلادانە لە کەوتنو شکستو زیانی دووبارە، ئەزموون خستنەژێر نەشتەری زانستە لە دنیای واقیعداو ڕوانینە بۆ دەرئەنجامەکانیو هەڵسەنگاندنو بەراوردکردنی ئەنجامەکانە، ئەزموون چرایەکە لە کەسانی تری وەردەگرینو ڕێگای ژیانی پێ ڕۆشن دەکەینەوەو نەخشەیەکە لە مامۆستاو داپیرەو باپیرەو کەسانی لە خۆمان بە ئەزموونترو دنیادیتووتر وەریدەگرینو لە ڕێگایەوە شارەزای سەختیو مەترسیو دژوارییەکانی ڕێ دەبینو خۆمانی بۆ ئامادە دەکەینو خۆمان دەپارێزین لەو زیانانەی بەکەسانی پێش ئێمە کەوتووەو لەو شوێنەوە دەست پێ دەکەین، کە ئەوان لێی وەستاون وەك دەگوترێت: (سوود لەوەی تێپەڕیوە وەربگرە، خۆت مەکەرە پەند بۆ کەسانی دوای خۆت).

ئازیزانم، هەر لە کۆنەوە گوتراوە: "ئەزموون شانەیەکە کاتێك بەدەستی دەهێنین، قژ بەسەرمانەوە نەمابێت". باشە بۆ ئەو شانەیە لە کەسانی پێش خۆمان وەرنەگرینو قژی ژیانی پێ دابهێنینو بتوانین لە ڕێگای شکستی کەسانی پێش خۆمانەوە، دەرسو وانە فێربینو لەسەرکەوتنەکانیان ئەزموونی سەرکەوتن وەربگرین وەك (ماکسوێڵ) لە کتێبی"سەرکەوتنی بنیاتنەردا" دەڵێت جیاوازی سەرکەوتوو و شکستخواردووەکان تەنها لەوەڵامدانەوەیانە بۆ شکستەکان، سەرکەوتووەکان لە هەموو شتێك ئەزموون وەردەگرن، لە کوردەواریشدا گوتراوە بەکەسێك ئەڵێن زاناو هۆشیار، لە کونێکەوە دوو جار پێوەی نەدا مار.

بیرمان نەچێت ژیانیش بەشی ئەزموونکردنی هەموو شتێك ناکات، بۆیە پێویستە لە ئەزموونی کەسانی پێش خۆمان وانە وەربگرینو هەر ئەوەشە فەزڵی مرۆڤی بەسەر گیانەوەرەکانی تردا داوە، ئەگەر باوباپیرانی ئێمە سوودیان لە ئەزموونی پێش خۆیان وەرنەگرتایە زانست وەك ئێستا پێش نەدەکەوتو ئەم هەموو گەشەکردنە تەکنەلۆژیو ژیارییە نەدەهاتە ئاراوە، لە کاتێکدا لە گیانەوەرانی تردا ئەو ئەزموون وەرگرتنە بوونی نییە. بۆ نموونە: ئەگەر مەڕێك لەبەرزیی لوتکەیەکەوە خۆی فڕێ بداتە خوارەوە؛ ئەوا تەواوی مێگەلەکە بەشوێنیدا دەڕۆن بێ ئەوەی بیر لەسەر ئەنجامی ئەوانی تر بکەنەوە!.

ئازیزان، لەبەرئەوەی ئێمە لە تاقیگەی ژیانداینو تەمەنیشمان بەشی ئەوە ناکات، ئەزموونی هەموو شتێك بکەینو خۆمان پێیدا تێپەڕبینو پاشان بڕیاری لەسەر بدەینو ئەزموونی لێ وەربگرین، بەڵکوو چەندین ڕێگا هەیە بۆ زیادکردنی ئەزموونی ژیانمان وەك ئەزموونی ناوەکی، واتە: ئەو شتەی دەمانەوێت ئەنجامی بدەین لەناخی خۆماندا لێکی بدەینەوەو هەڵسەنگاندنێکی وردی بۆ بکەین، ئەوسا بڕیاری جێبەجێکردنی بدەین، یاخود هەمیشە سەرنجمان هەبێت بۆ شتەکان لە ئەمڕۆمان پەندێك وەربگرینو لە دوێنێش ئەزموونێكو لە هەنگەوە ئەزموونی ڕێکخستنو لە مێرووڵەوە شێوازی کارکردن وەربگرین، بۆ زیادکردنی ئەزموونی ژیانمان چەند خاڵێکی دی دەخەینە ڕوو:

١. خوێندنەوە، خۆراکی بیری مرۆڤەو لە ڕێگایەوە دەتوانین دەستمان بەزۆر شوێن بگاو لە خزمەت چەندین داناو زانادا دابنیشینو ئەزموونی ژیانیان لێوە فێر ببینو لە نێوان دێڕو لاپەڕەکاندا زۆر نهێنیی ژیان بدۆزینەوەو ژیانو ڕووداوو بەسەرهاتی کەسانو گەلانی پێش خۆمان بخوێنینەوەو پەندو ئەزموونو وانەیان لێوە فێر ببین.

٢. سەرنجدان لە کەسانی دەوروبەرو ئەو ڕووداوانەی ڕوو دەدەنو تێڕامان لە هۆکاری شکستو سەرکەوتنی کەسو کۆمپانیاو دامەزراوەو وڵاتەکانو وەرگرتنی پەندو ئەزموون لێیانەوە.

سوود وەرگرتن لە خاوەن ئەزموونەکان وەك مامۆستاو باوكو دایكو داپیرەو باپیرەو کەسانێك کە زۆر شتیان بینیوەو زۆر ئەزموونکراونو حیکمەتو داناییان هەیەو ژیرو دنیا دیدەنو خشتی سوور ئەخوێننەوەو بەئیشارەتێك تێ دەگەنو ژیان وانەی فێرکردونو ئاگری ئەزموون برژاندونی.

٣. بەشداریکردن لە خولو کۆرسی پێگەیاندنو بەهێزکردنو باڵاکردن، کە مرۆڤ تێیدا زانستی ژیان وەربگرێتو گوێ لە کەسانی شارەزاو پسپۆڕ بگرێت، ئەزموونی ژیانی زیاد بکات.

٤. سەفەرکردنو گەڕانو بینینی وڵاتو کەلتوورو شێوازی ژیانی جۆراجۆر بیری مرۆڤ دەوڵەمەند دەکاتو ئاسۆی هۆشو بیرکردنەوەی واڵا دەکات، مرۆڤ لە کاتی سەفەردا هەر ساتێکی بەئەندازەی چەندین کاتی ئاسایی ئەزموون وەردەگرێتو شتی نوێ فێر دەبێتو کۆگای ئەزموونی فراوان دەبێت، سەقفی بیرکردنەوەو دونیابینی بەرز دەبێتەوە.

بەو هیوایەی ئەزموونی ژیانمان دەوڵەمەند بکەین؛ بۆئەوەی لەژیانماندا بەختەوەریو سەرفرازی بەدەست بهێنینو ژیانو تەمەنمان، نموونەی ئەزموونێکی سەرکەوتووبێت.

- شتێك، یاخود كەسێك لە دەست بدەیت، كە توانای بەرگەگرتنی ئەو لەدەستدانەت نەبێت.
- خۆزگە بۆ گەڕانەوەی ڕۆژگارە خۆشەكانی ژیانت بخوازیتو هیچیشت لەدەست نەیەت بۆ گەڕانەوەیان.
- بە دڵ بیری كەسێكی ئازیزت بكەیت، سەفەرێكی كردبێتو نەگەڕێتەوە.
- بە دەنگی بەرز هاوار بكەیتو هیچ گوێیەك نەبێت، بیبیستێت.
- هەست بە زوڵمو ستەم بكەیت بەرامبەرتو هیچ كەسیش نەبێت، هەقت بۆ بسێنێتەوە.
- لە بەردەم ئاوێنەدا بوەستیتو خۆت نەناسیتەوە.
- چاوەكانت دابخەیت؛ بۆ دیتنی خەونێكی جوان، چاو بكەیتەوە لە بەرامبەر واقیعێكی دڵسووتێنەر.
- ناچاربیت ڕۆڵێك بگێڕیت كە هەرگیز لەگەڵ كەسایەتی تۆدا گونجاو نەبێت.
- بە دەنگی بەرز پێبكەنیت؛ بۆ شاردنەوەی دەنگی گریانەكانی ناوناخت.
- ماسكی خۆشبەختی بپۆشیت؛ بۆ شاردنەوەی غەمو ئازارە ڕاستەقینەكان لە ڕوخسارتدا.
- تووشی بەڵاو تاقیكردنەوەی سەختی وەها ببیت، كە هێشتا تەمەنو توانات هی ئەوە نین، بتوانیت بەرگەیان بگریت.
- لە ناخەوە گومانت لە هەموو كەسانی دەوروبەرت هەبێت، بە هۆی ناڕاستبوونیان لەگەڵت.
- كاتێك دەتەوێت بنوویت، لە قووڵایی دڵتەوە ئاوات بخوازیت كە هەرگیز خەبەرت نەبێتەوە.
- بە ساتی وا سەختدا تێپەڕ ببیت، كە ئاوات بخوازیت تووشی لەبیرچوونەوە ببیت بۆ لەیادكرنیان.
- كەسانی چواردەورت لە ناكاو بگۆڕێن بەبێ پێشەكییەك كە خۆت ئامادەكردبێت بۆ قبوولكردنی.
- چەندین پرسیارلە ناختدا بێتو هەرگیز توانای بەدەستهێنانی وەڵامەكانیانت نەبێت.
- بەشێكی ژیانت لە چاندنی گوڵدا بەسەر ببەیت لەسەر ڕێگای كەسانێك، ناچاربیت بەشێكی كەی ژیانت بە هەڵكەندنی ئەو دڕكانەوە ببەیتەسەر كە ئەوان لەسەر ڕێگەت ڕواندوویانە.
- ڕۆژێك بگەیتە ئەو قەناعەتەی هەرچی لە ژیانتدا تێپەڕبووە، بە شێك لە وجودی تۆی لەگەڵ خۆیدا بردووەو هەرگیزیش ناگەڕێنەوە.

بەڵام... دڵنیابە كە هەموو غەمو ئازارێك كاتو شوێنێكی تایبەتی هەیەو ڕۆژێك دێت كۆتاییان دێت. دكتۆر مستەفا مەحموود دەڵێت: "هیچ موسیبەتو نەهامەتییەك نییە كە لە ساتێكدا دوو جار دووبارە ببێتەوە، وەك چۆن ئاوی ڕووبار دووجار بەیەك شوێندا ناڕوات".

لەوانەیە غەمو ئازارو موسیبەتی زۆرت بینیبێت، بیشیبینیت، بەڵام ئەو ڕاستییە بزانە كە ئەو لێدانەی پشتت نەشكێنێت، بە هێزترت دەكات.. گەر غەمو ئازارەكانو زوڵمو ستەم، هەموو دنیاشت لێ تەنگو تاریك بكەن، هەرگیز پەیوەندیت لەگەڵ خوداوەندی خۆت مەپچڕێنەو دڵنیابە كە مەبەستی تایبەتیی هەیەو ئەركە مەزنو ناوازەكانیش بە كەسانی شایستەو مەزن دەسپێررێنو نیازی مەزنی بە هەركەسێك هەبێت، دەیخاتە ناو ئازارو تاقیكردنەوەی سەختەوە، تاوەك ئاسنی لە كورەنراو بتوێتەوەو دووبارە بەپێی ویستی خۆی درووستی بكاتەوە بۆ مەبەستی تایبەتیو ئەركی گەورەو مەزن. وەك گوتراویشە (إن الهموم لن يدوم- مثلما تنفي السعادة كذلك تنفي الهموم). گوتراویشە تەنها كەمێك لە هیواو ئومێد، هەزاران ڕێگەی گەیشتن بە بەختەوەریت بۆ درووست دەكات.

دكتۆر ئیبراهیم فەقێ لە گوتەیەكی بەناوبانگیدا دەڵێت: "هەموو چركەساتێكت وا بژی كە كۆتا ساتە، بە هیواو ئومێدەوە بژی، بە سەبرو ئارامگرییەوە بژی، بە خۆشەویستیو موحیبەتەوە بژی، هاوكات نرخو بەهای ژیانت بزانە".

لە دواین وەسێتیشیدا كە چەند ساتێك پێش دواین كۆچی بڵاوی كردەوە دەڵێت: "خۆت بە دوور بگرە لەو كەسانەی كە هەوڵ دەدەن لە نرخو بەهای خەونو ئامانجەكانت كەم بكەنەوە، لە كاتێكدا كەسانی مەزن ئەو هەستەت پێ دەبەخشن كە تۆیش توانای ئەوەت هەیە كە ببیت بە یەكێك لەوان".

كەواتە: گەرچی لە ژیاندا شتانێكی ناخۆش هەن، كە بە سەختی ئازار بە ڕۆحو ناخمان دەگەیەنن، بەڵام پێویستە هەرگیز نائومێد نەبینو هەمیشە بەردەوام بین لە هەوڵدان، تا گەیشتن بە بەختەوەریی ڕاستەقینە.

## ئەو شتانەی ئازار بە ڕۆحو دڵ دەگەیەنن، بەڵام..



ئا/ ناز سەعید

# وەڵامی بەجێ



**ئەسکندەری مەکدۆنی لە ئەرستۆی پرسی: چی باشترە بۆ پادشاو سەرۆکەکان؟**

**ئازایەتی، یاخود دادەروەری؟**

**ئەرستۆش لە وەڵامدا گوتی: ئەگەر پادشا دادپەروەر بوو، پێویستی بە ئازایەتی نییە!**

**پیاوێك بە ئیبن عەباسی گوت: داوا بکە لە خودا کە بێنیازم بکات لە خەڵکی؟**

**ئیبن عەباس لە وەڵامدا گوتی: پێداویستییەکانی خەڵکی پەیوەندییان بە یەکترەوە هەیە، هاوشێوەی پەیوەندیی ئەندامەکانی جەستەی مرۆڤ، چ کاتێك مرۆڤ دەتوانێت بێنیاز بێت لە هەندێك ئەندامەکانی جەستەی؟ کەواتە: تۆ دەتوانیت بڵێی خودایە بێنیازم بکە لە خەڵکانی خراپ.**

**پیاوێك بە یوسفی ڕاستگۆی گوت: من تۆم زۆر خۆش دەێت..**

**ئەویش لە وەڵامدا گوتی: خۆشەویستی جگە لە ناڕەحەتیو دەردەسەری، شتێکی دیکەی بۆ من نەهێناوە! باوکم خۆشی ویستم، لەسەر ئەو خۆشەویستییە خرامە ناو بیرەوە، خێزانی عەزیزی میسر خۆشی ویستم، لەسەر ئەو خۆشەویستییەی چەندین ساڵ خرامە نێو زیندانەوە!**

**پیاوێك پرسیاری لە فوزەیلی کوڕی عەیاز کرد کە چاوی نەیدەبینی،**

**گوتی: ئێستا چۆنی کە چاوت لەدەست دا؟ لە وەڵامدا وتی: دوو شتی چاکم دەستکەوتووە:**

**یەکەمیان: نابینایی وای کردووە چاوم بپارێزم لە گوناه.**

**دووەمیان: سەیری چارەگرانێکی وەکو تۆشی پێ نەکەم.**

ئامانج لە ژیان ئەوە نییە کە دەوڵەمەند بین، ئەگەر بە دەوڵەمەندی با، دەبوا هەموو دەوڵەمەندەکان بەختەوەر بوونایەو لە خۆشیدا سەمایان بکردایە.

- پۆڵ ڤۆلکەر - ئابووریناس

هەموو مرۆڤێك لە دیدی خۆیدا، کەسی باشە، هەرگیز مەرج نییە هەڵۆکان ببن بە قەلەڕەش.

- ستینگ پۆڵ - سەرکردەیەکی سیاسی

هەرگیز شکستی تاکەکەسیو شکستی کۆتایی تێکەڵ مەکە

- ئێف سکۆت - نووسەر

کاتێك دەرگایەك دادەخرێت، دەرگایەکی دی دەکرێتەوە، بەڵام ئێمە چاومان هەر لەسەر دەرگا داخراوەکەیە.

- گراهام بێل - داهێنەر

بوێری، بوێری، هەمیشەش بوێری.

- جاك دانتۆن - شۆڕشگێڕ

# گۆرانی بێ بۆ ژیان

# بڕیار لە دیدی خوێنەرانی شاری (هەولێری قەڵاومنارە)دا

بڕیار وەك هەنگێکی ماندوونەناسو لە خۆبردوو، مانگانە سەر دەکات بە دەرگای دڵی گشت خوێنەرانیداو تاسەو تینوویەتیو ماندوبوونی دەروونە شەکەتەکان دەڕەوێنێتەوە، هەر بۆیە خوێنەرانی ڕۆژی یەکەمی هەموو مانگێك بە شەوقەوە لە چاوەڕوانی ژوانی بڕیاردان، دەمانەوێت لەم ڕیپۆرتاژەدا ئەو شەوقو تامەزرۆییە، ڕاستەوخۆ لە هەستو نەستی خوێنەرەکانتان بۆ بگوازینەوە، لە ڕێی دەربڕینەکانی خۆیانەوە باسی (بڕیار) بکەن...



* سەرەتا جەنابی مامۆستا (فاتیح شارستێنی) وتارخوێنی مزگەوتی (ڕێگای بەهەشت) بەم شێوەیە باسی بڕیاری بۆ کردین:

گۆڤاری بڕیار، ئەو گۆڤارە بە نرخەیە کە هەمیشە چاوەڕێی مانگی نوێ دەکەین، بۆ چاوڕۆشنیمان بە بابەتە جوانەکانی، بە پەیڤە شیرینەکانی، بە چیرۆکە سەرنجڕاکێشەکانی، بە شیعرە ناسکەکانی، بەڕاستی دەرچوونی ژمارە (١٠٠)ی ئەو گۆڤارە ناوازەیە کوردییە، ڕەسەنە، فرەڕەنگە، بێلایەنە، پێگەیەنەرە، بنیاتنەرە، دوای دوعای خێر بۆ ئەو دەستو پەنجە ڕەنگینانە، بەبرشتانە، ماندوونەناسانە، تا ئێرەیان هێناوە، ئومێدەوارم خوای پاڵپشتی چاکەکارانو جوانکاران، تەمەنیان پڕ بەرەکەت بکاتو ڕۆژی (سفرێك) بۆ ژمارە (١٠٠)ی گۆڤاری (بڕیار)یش لەبەردەم ژمارەکەیدا دابندرێتو نەوەی داهاتووتر، چەند سفرێك لەبەردەم ژمارەی دوای یەکدا بنێن.

هەروەها وەکو وتارخوێنێك، بەڕاستی گۆڤاری بڕیار یەکێکە لە سەرچاوەکانی وتارەکانمو ئیلهامبەخشی زۆر وتارم بووە.

جا لەو ڕوانگەوە کە وەکو موسڵمان، ئەوەی خۆم پێم خۆشە لە خێر تووشم بێت، حەزیش دەکەم کە هەموو تاکێکی نەتەوەکەم بەتایبەت هاوپیشەکانم، هەمان خێرمان دەستگیر ببێت، بۆیە داوا دەکەم تەواوی وتاربێژان، خوێنەری هەمیشەیی گۆڤاری بڕیار بن، هەمیشە سەرفرازو خاوەنی بڕیاری ئاوا درووست بن.



* مامۆستای بەڕێز مامۆستا (حەمزە عەباس فقێ) سەرنووسەری (گۆڤاری ژیار)ی پەروەردەیی لە وەسفی بڕیاردا نووسیویەتی:

ستافی (بڕیار)، بە بڕیارێکی مەزن دەستیان پێ کرد، بڕیاری کارێکی درووستیان دا، بە هێنانەبوونی (گۆڤاری بڕیار)، کارێکی بێپێشینەو کەموێنەو دەگمەن، بوو بە سەرەتایەکی ڕازاوە بۆ شاکارێکی پوختو تایبەتمەند، خۆدان لە قەرەی چوار بواری هەستیارو سەردەمیانە بە شێوازێکی مۆدێرنو زانستییانە، جەسارەتی دەوێت.. بواری پەروەردەو گەشەپێدانی مرۆیی لە لایەکو کارو کارگێڕیو بازاڕسازی لەلایەکی تر، ئەو مەیدانانەن کە ئەم گۆڤارە ئازیزە ئەسپی خۆی تێیاندا تاو داوەو بوێرانە وشەو دێڕو لاپەڕەکانی، کردۆتە مەزرای بەرهەمو سەوزایی ئەزموون.

من وەك خوێنەرێکی بەردەوامی ئەم گۆڤارە قەشەنگە، هەموو مانگێك بە تاسەوە لە چاوەڕوانی مەلۆی بە برشتی نووسەرانی

ئا. م. محمد عبدالله مێرگەیی



# بڕیار لە دیدی خوێنەرانی شاری (هەولێری قەڵاومنارە)دا

بڕیـار وەك هەنگێكی ماندوونەناسو لـە خۆبردوو، مانگانە سـەر دەكات بـە دەرگای دڵـی گشـت خوێنەرانیـداو تاسـەو تینوویەتـیو ماندوبوونـی دەروونە شـەكەتەكان دەڕەوێنێتەوە، هەر بۆیە خوێنەرانی ڕۆژی یەكەمی هەموو مانگێك بە شەوقەوە لـە چاوەڕوانی ژوانی بڕیـاردان، دەمانەوێت لەم ڕیپۆرتاژەدا ئەو شەوقو تامەزرۆییە، ڕاستەوخۆ لە هەستو نەستی خوێنەرەكانتان بـۆ بگوازینەوە، لە ڕێی دەربڕینەكانی خۆیانەوە باسـی (بڕیار) بكەن...



* سـەرەتا جەنابی مامۆسـتا (فاتیـح شارسـتێنی) وتارخوێنـی مزگەوتـی (ڕێـگای بەهەشـت) بەم شێوەیە باسی بڕیاری بۆ كردین:

گۆڤاری بڕیار، ئەو گۆڤارە بە نرخەیە كە هەمیشە چاوەڕێی مانگـی نوێ دەكەین، بۆ چاوڕۆشـنیمان بە بابەتـە جوانەكانی، بـە پەیڤە شـیرینەكانی، بە چیرۆكـە سەرنجڕاكێشـەكانی، بە شیعرە ناسكەكانی، بەڕاستی دەرچوونی ژمارە (١٠٠)ی ئەو گۆڤارە ناوازەیە كوردییە، ڕەسـەنە، فرەڕەنگە، بێلایەنـە، پێگەیەنەرە، بنیاتنـەرە، دوای دوعای خێر بۆ ئەو دەسـتو پەنجە ڕەنگینانە، بەبرشتانە، ماندوونەناسانە، تا ئێرەیان هێناوە، ئومێدەوارم خوای پاڵپشـتی چاكەكارانو جوانـكاران، تەمەنیان پڕ بەرەكەت بكاتو ڕۆژی (سـفرێك) بۆ ژمـارە (١٠٠)ی گۆڤاری (بڕیار)یش لەبەردەم ژمارەكەیدا دابندرێتو نەوەی داهاتووتر، چەند سفرێك لەبەردەم ژمارەی دوای یەكدا بنێن.

هەروەها وەكو وتارخوێنێك، بەڕاسـتی گۆڤاری بڕیار یەكێكە لە سەرچاوەكانی وتارەكانمو ئیلهامبەخشی زۆر وتارم بووە.

جا لەو ڕوانگەوە كە وەكو موسڵمان، ئەوەی خۆم پێم خۆشە لە خێر تووشـم بێت، حەزیش دەكەم كە هەموو تاكێكی نەتەوەكەم بەتایبەت هاوپیشـەكانم، هەمان خێرمان دەسـتگیر ببێت، بۆیە داوا دەكەم تەواوی وتاربێژان، خوێنەری هەمیشەیی گۆڤاری بڕیار بن، هەمیشە سەرفرازو خاوەنی بڕیاری ئاوا درووست بن.



* مامۆسـتای بەڕێز مامۆسـتا (حەمزە عەباس فقێ) سەرنووسـەری (گۆڤـاری ژیـار)ی پەروەردەیـی لـە وەسفی بڕیاردا نووسیویەتی:

ستافی (بڕیار)، بە بڕیارێكی مەزن دەستیان پێ كرد، بڕیاری كارێكی درووسـتیان دا، بە هێنانەبوونی (گۆڤاری بڕیار)، كارێكی بێپێشـینەو كەموێنـەو دەگمەن، بوو بە سـەرەتایەكی ڕازاوە بۆ شـاكارێكی پوخـتو تایبەتمەند، خۆدان لە قـەرەی چوار بواری هەسـتیارو سـەردەمیانە بە شـێوازێكی مۆدێرنو زانسـتییانە، جەسـارەتی دەوێـت.. بواری پەروەردەو گەشـەپێدانی مرۆیی لە لایەكو كارو كارگێڕیو بازاڕسـازی لەلایەكی تر، ئەو مەیدانانەن كـە ئەم گۆڤارە ئازیزە ئەسـپی خۆی تێیاندا تـاو داوەو بوێرانە وشـەو دێـڕو لاپەڕەكانی، كردۆتـە مەزرای بەرهەمو سـەوزایی ئەزموون.

من وەك خوێنەرێكی بەردەوامی ئەم گۆڤارە قەشەنگە، هەموو مانگێك بە تاسـەوە لە چاوەڕوانی مەلۆی بە بڕشتی نووسەرانی

ئا. م. محمد عبدالله مێرگەیی



بۆ خەرمانی زانستو ئەزموون، چاو لە ڕێم، بەردەوامی بێ دواکەوتن، پوختی لە نووسین، هاوسەنگیو گوزارشت لە وێنە، جوانیو تایبەتمەندی لە دیزاین.. لە سیماو خەسڵەتەکانی ئەو گۆڤارەن، هەر یەکێکیش لەمانە پایەی بە هێزوسەرەکین بۆ سەرکەوتنی هەر کارێك.. لێرەوەو بەبۆنەی دەرچوونی سەدەمین ژمارەی بڕیارەوە، پڕ بە دڵ پیرۆزبایی لە ستافی (گۆڤاری بڕیار) دەکەمو هیواخوازم بەردەوامبوون درووشمیان بێتو بە پەیژەی کۆڵنەداندا، وەك هەمیشە سەر بکەونو لەخزمەتکردن بەردەوام بن.



*** بەڕێز (کاك سیروان) خاوەنی (خانەی سیروان) لە وەسفی (گۆڤاری بڕیار) دا دەڵێت:**

بەبۆنەی دەرچوونی (١٠٠)ـەم ژمارەوە، دەستی یەکە بە یەکەی کارمەندان دەگووشمو هیوادارم قەڵەمەکانتان لە خزمەتی بواری مرۆڤایەتیدا بێت، من وەکو خاوەنی (خانەی سیروان) لە ژمارە یەکەوە خوێنەرو فرۆشیاری ئەم گۆڤارەمو ڕۆژ بە ڕۆژ بەرەو پێش دەچێتو لە هەموو چینو توێژەکان، خوێنەری خۆی هەیە، دەتوانم بڵێم یەکێکە لەو گۆڤارانەی ئەسپی خۆی لەو بوارەدا تاو داوە، من هیچ ڕەخنەیەکم نییە لە گۆڤارەکەتان، تەنها چەند پێشنیارێکم هەیە:

١- هەر جارەو خوێندنەوە بۆ کتێبێك بکەن لە کتێبە بەسوودەکان.

٢- هەموو ژمارەیەك، خوێنەرێك لە خوێنەرەکانی ئەم گۆڤارە بەسەر بکەنەوە.

٣- بەردەوامبوونی لاپەڕەی لەگەڵ شاعیراندا.

دووبارە دەستتان خۆش بە هیوای بەردەوامبوون.



*** بەڕێز دکتۆر (ئیبراهیم تاهیر مەعرووف) بەبۆنەی دەرچوونی (١٠٠)ـەمین ژمارەی گۆڤاری بڕیارەوە نووسیویەتی:**

هەموو مانگێك (گۆڤاری بڕیار) خۆی دەدات بە دەرگای دڵو ماڵەکاندا، دەبێتە میوانێکی ڕۆحسووك، بە بابەتە بەپێزەکانی ئاودێریی دڵە خامۆشەکانو ئاوەزە ماندووەکانو جەستە شەکەتەکان دەکات، وەکو بارانێکی ڕەحمەت بەسەر میللەتدا دەبارێت، لە پیرو منداڵو گەنج، تاکو خێزانو کۆمەڵگا، ناو ناوەش بە گوێی دەسەڵاتو بەرپرساندا دەچرپێنێت، دەمێ دەدا بە لای عارفانو خاسانو دەمێکیش لاپەڕەکانی ئەدەبیاتە بێنازەکەمان هەڵدەداتەوە، جارجارەش دەستی گەنجو لاوەکانمان دەگرێتو لە تاریکاییو ڕۆژگاری ئەمرۆماندا، ڕێنیشاندەرێکی دڵسۆز دەبێت بۆیان، وەکو پیرێکی ئەزموونداو دونیادیدەش ئامۆژگاریی خێزانو دایكو باوکان دەکات، بە هیوای هاتنە کایەی خێزانێکی نموونەیی.

هەموو ئەو گەوهەرانەی گۆڤارەکە بێئاگامان ناکات لەوەی بابەتە کارگێرییەکانی کە بەشێکی زۆری لاپەڕەکانی (بڕیار)ی تەنیوە، دەتوانن ببنە سەرمەشقی چاك بۆ بابای سەرکردەو بەڕێوبەرو فەرمانبەرو..... هتد.

لە کۆتاییدا هیوای سەرکەوتن بۆ ئەم مۆمە درەوشاوەو تاقانەی خۆمان دەخوازم، هیوادارم خەرمانی کارتان بە بڕشتتر بێت، کارو خزمەتی زیاتر پێشکەش بکەن.



*** دکتۆر (مظهر صابر سورچی) دکتۆرا لە بایلۆجیو مامۆستا لە زانکۆی صلاح الدین بۆ (گۆڤاری بڕیار) گوتی:**

کاتێك دەبیستم ژمارە (١٠٠)ی گۆڤارێکی گەشەپێدانو پێگەیاندنی مرۆڤ دەردەچێت، خۆشحاڵی خۆمو سوپاسگوزاری بۆ دەستەی کارگێڕیو نووسەرانو خەمخۆرانی ئەم گۆڤارە پێشەنگە دەردەبڕم، بەڕاستی ماندوونەناسانە توانیویانە نەك تەنها ببن بە ژمارە لەنێو گۆڤارە کوردییەکاندا، بەڵکو سەرمەشقن لە نێو نوخبەی کۆمەڵگەو مامۆستایانو ڕۆشنبیرانو خەڵکی بە گشتی.

من وەك دکتۆرێکی زانکۆ لە بواری بایلۆجی زۆربەی ژمارەکانیم خوێندۆتەوە؛ چونکە مێشکی مرۆڤ پێویستی بە خۆراکەو باشترین خۆراك ئەو گوتارو نووسیانەن کە لە گۆڤاری بڕیار بڵاو دەکرێنەوە، بۆ دەستکەوتنی زانستو زانیاریو درووستکردنی کەسایەتیی پتەوو بەهێزکردنی باکگراوندی فیکریو دەروونیو تێڕوانینی ڕاستەقینە، بەرامبەر بە پێشهاتو ڕووداوە درووستکراوەکان.

ڕاستییەکەی پێم باشە ئەوەی بەڕێز ئەو گوتارو نووسینانەتان لە ئاستی نوخبە دابەزێنن بۆخەڵکی گشتی، بۆ نموونە: نووسینەکانتان بکەنە پرۆگرامی تەلەفزیۆنی بە شێوەی سیناریۆو کورتەتەمسیلو گۆرانیو بەرنامەی تایبەت، تا خەڵکی نەخوێندەواریش سوودی لێ ببینێت؛ چونکە بەڕاستی گۆڤاری بڕیار بونیاتنەرە.



ڕەسەن مەسعوود طاهر

بەڕێز د. مەسعوود طاهر یونس خاوەن ئیمتیازی گۆڤاری بڕیار لە نامەیەکیدا بۆ بڕیار دەنوسێت: (لە بەرەبەیانی ئیمرۆ ٢٠١٦/٨/٩ کاتێك ڕەسەنی کوڕە بچووکم، گۆڤاری بڕیاری بە دەستەوە بوو، گوتی: بابە، بە خودای ئەو گۆڤارە زۆر بەکەڵکە. گوتم: بۆچی؟ گوتی: تەماشای ئەو وشە جوانانە بکە، لە لاپەڕەی " لە سەرکەوتن گەورەتر" لە کارگێڕی بە چیرۆك، بە خودای بابە ئەوە زۆر شتی گەورەی فێر کردم، ئەو دوو دەستەواژەیەش لە "تەنها بۆ سەرکردەکان": دڵسۆزی لە کارو دەسپاکیو ئەمینداری، بە خودا ئەو گۆڤارە ئەگەر بیری لێ بکەینەوە؛ زۆر شتمان فێر دەکات، لە قوتابخانە گرنگترە، چونکە وتەکانی دەچنە ناو دڵم.

# پرۆسەی بەگێلکردنی نەوەکانی دواڕۆژ!

منداڵی تەندرووست، بە شەونخونیکردنو قوربانیدان لەگەڵیدا بەدی دێت، ئەوە منداڵە کە دەتوانێت دەروونت ئارام بکاتەوەو قەناعەتت بۆ درووست بکات، خەرمانی خێزان شەن دەکاتو نەمری دەکاتە خەڵات بۆ خێزان، ئەرکی خێزانیشە، کاریگەری ڕاستەوخۆی لە پەروەردەکردنی نەوەیەکی ساغدا هەبێت، خێزان دەتوانێ بە کۆمەڵێك وشەی ئاڵتوونی بەهەشت بۆ گوڵئاساکانی دواڕۆژ بخوڵقێنن، پێویستیمان بەپەروەردەکردنی ئەو منداڵەیە (وریا، کۆمەڵایەتی، بەڕەوشت)، دنیاش جگە لە خەندەی منداڵێكو سەرابێکی فریودەر، لەزەتێکی تری تێدا نییە! ئەوە خێزانە دەتوانێت لەبری خەرابستان، گوڵستانێکی بۆنخۆش بۆ منداڵ درووست بکاتو گوڵاوێکی نەمریان لە ژیاندا بۆ بڕژێنێت، هەر خێزانیشە کە کێشەگەلێکی زۆر بۆ منداڵ دەخوڵقێنێت، کە ڕۆژانە لەبەر چاوماندا ڕوو دەدەنو هەندێجار مەوداکان بەڕادەیەکی زۆر بەرز دەکەنەوەو لێکدوورکەوتنەوەیەکی ترسناك لە نێوان ئەندامانی خێزاندا ڕوو دەدەن، کە دوور نییە ئەم ئاریشەگەلانە لێکترازانیان لێبکەوێتەوە.

پرۆسەی بە گێلکردنیش یەکێکە لەو دیاردە دیارانەی کۆمەڵگای کوردەواریی، کە ڕەگێکی درێژی هەیە لەناوماندا‌و ئێستاش منداڵەکان بەو پرۆسەیە گۆش دەکرێنو هاندەدرێنو پێیان دەگوترێت: ئای!چەند ئازای وەرە سەرت بدە لە دیوارەکە، مستێك بدە لە دارەکە ....هتد. ئافەرین کوڕی ئازا، دەی بەردەوام بە جا لەپای ئەوە، منیش نوقڵێکت دەدەمێ! دەی ئەمجار خۆت لە ناو خۆڵەکە بگەوزێنە، دەی زیاترو زیاتر، کوڕینە ئێوەش چەپڵەی بۆ لێ بدەن، هەم ئازارت دەدا، هەم بە نوقڵێکیش کە نیشانەی خۆشییە لای منداڵ دەیکاتە ژەهرێکی کوشندەو مانایەکی تری ناشایستەی پێ دەبەخشێت! دەبێ لەهەمبەر ئەو کارە ناشایستانەی ئێمەدا، چارەنووسی ئەو منداڵانە بەرەو چ شەقامێك هەنگاو بنێ؟!

بەداخەوە هەندێجار ئەو هەستە بۆ ئەندامانی خێزانیش دەگوازرێتەوە، ئەوانیش پرۆسەی بەگێلکردنەکە فراوانتر دەکەنو لەسەرەتاوە ناوێکی نەشیاو کە لێوانلێوە لە ڕووخانی منداڵ، دەکەن بە دیاری بۆیو ئەو ناوەش بۆ ماوەیەکی زۆر هاوژینی دەبێتو بە هەموو شێوەیەك دەبێتە بەربەست لەبەردەم گەشەکردنی تواناکانی ئەو منداڵە. لە غیابی ئەو بێنازییەدا تووشی چەندین هەڵە دەبنەوە کە کاریگەریی ڕاستەوخۆیان هەیە لەسەر داهاتوویانو لە سۆنگەی ئەو گرنگی پێنەدانو بێنازییەدا، فێری کۆمەڵێك هەڵەی ناشایستەو کۆمەڵێك جنێوی ئەفسوناوی دەبن کە بۆ ماوەیەکی زۆر زمانیان دەتەنێ.

ئای چ دیمەنێکی هەستبزوێنە، کە لەبری بەخشینی گەشبینی، ئێمە دەیانخەینە ناو دەریای غەریبییەوە، با نیگایەکی میهرەبانو سۆزێکی مرۆڤانەمان هەبێت، کە ئەوە لە مرۆڤە حەقیقیەکاندا بەدی دەکرێت، با سارێژی برینەکان بین، نەك هۆکاری درووستکردنی برینەکانی ناخ بین، کە سارێژکردنیان ئاسان نەبێت، بەڵام درووستکردنی ئازارەکان بۆتە میوانی هەمیشەیمان! دایكو باوکانیش بە ڕووخسارێکی خەمبارو بەنیگایەکی ماندوو شەکەتەوە توانای گوفتارێکی ناسکیان نەبێ لەگەڵیاندا، ئەوە پرۆسەکە بەرەو پێشتر دەبات. لەوەیە ڕۆژێك پەی بەوە ببەن، کەوا ماڵێکی بێلانەیان بنیاتناوە کە ئەو منداڵانە نامۆن بەزۆرێك لەو سەعادەتو کامەرانییەی کە ئەرکی خێزانە بەرهەمی بهێنێت، ئارامییەك ئاوێتە بە بەحری پڕنووری ئەوان نابێت.

ئەوان عەودالی ڕەنجێکی زۆری ئەوان نین، ڕۆحی ئەوان جگە لە پاروویەك نانو خەندەیەکی ناسكو چرپەیەکی نیگابەخشی بزەبەخش؛ تا دەریایەك لە پاکیو گوڵزارێك لە بۆنی خۆش فەراهەم بکەن. خەممە بزانم ناخی ئەو منداڵانە چۆن بێت، کاتێك هەست بکەن بۆ خێزانەکانیشیان مایەی ناخۆشیو پەژارەو شەرمەزارین! چ دیمەنێکی هەستبزوێنە، لەبری بەخشینی ئەوینو گەشبینی پێیان، دەیانخەینە ناو سەرابستانەوە! زمان لاڵ نابێت، کاتێك ئەو ستەملێکراوانە دەبینین، کە بەدوای کامەرانییەکی سادەدا وێڵن، بێئاگان لەوەی کە ئەو پۆلە چاوگەشەی نیشتمان سینەیان لێوانلێوە لە خەونو ئاواتی ئاوازە، چاوەڕێی ئەوە دەکەن، بێ جیاوازی لە لێواری ئەم ژیانەدا، هەناسەیەکی فێنك هەڵبمژن، کە سینەیان پڕ بکا لە ئاوازی بولبولی دەنگخۆش، منداڵ لەپای هەموو کارێکیدا، پێویستی بە پاداشت هەیە؛ تا زیاتر هان بدرێن بۆ ئەنجامدانی ئیشی جوانترو شەکاوەتر، پێدانی پاداشت کاریگەریی ڕاستەوخۆی ئیجابی دەبێت، جا پاداشتەکە مادی بێت، یاخود مەعنەوی.

با هەموومان حەزێکی جادوویانەمان هەبێت لە گۆشکردنی منداڵان؛ بۆئەوەی بەنەرمیو بەدەم بزەیەکی ژیانەوە، مانای مرۆڤبوون بەدەست بهێنن. با لەو خەزانەی پاییزدا دەشتو کێویان بۆ بکەین بە گوڵستانو بەرامەی ئەوینیان بۆ بکەین بە چەپکە گوڵی ڕازاوەی دەستمان.



هیوا علی



# بێ باران نامرین

**کیژان فەرەج**

جاران وام دەزانی... گەر باران نەبێت؛ نێرگز نابێت، گوڵەکان چرۆ ناکەن، بەهار نابێت! ئیتر چەترەکان دروست ناکرێن! شارەکان پاك نابن! جوانییەکان نامێنن!

جاران وام دەزانی... گەر خۆر نەبێت؛ تیشکی خۆر نابێت! مانگیش نابێت! پەلکەزێڕینەش نابێت!

پتر وام دەزانی... گەر دەریاکان نەبن؛ ماسی نابێت، شەپۆل نابێت! کەشتییەکان دروست ناکرێن!

وا تێ گەیشتبووم.... گەر نان نەبێت، پارە نەبێت؛ مرۆڤ دەمرێت! زەردەخەنەکان نابن!

وام دەزانی.... گەر دایك نەبێت؛ ژیان وێران دەبێت، ماڵ کاول دەبێت! گەر باوك نەبێت؛ منداڵ بێپارەو بێلانە دەبێت!

نا ئازیزم، هیچی بەو جۆرە نەبوو کە تێی گەیشتبووم!

ئێمە خەریکین خوو دەگرین بە هۆکارەکانەوە! وا هەست دەکەین، ئەوانن جوانییەکانمان پێ دەبەخشن، ئەوانن دەمانژێنن! دڵمان وابەستەی هۆکارەکان کردووە، نەوەك وابەستەی بکەین بە بەدیهێنەری هۆکارەکان! بۆیە هەموو کات دڵەکوتێمانەو هەرگیز دانامرکێین، ئەو کاتەی بەڕێوبەرەکەمان پێمان دەڵێت: چیدی موچە نییە! ئیتر ئارامی لە دڵمان دەتۆرێتو وەك ئەوەی بڵێی ڕزقدەری چەند ساڵەی تۆ، بەڕێوبەرەکەت بوو بێت! دەڵێی ڕۆژێك لە ڕۆژان، ئەو ئایەتەمان نەخوێندۆتەوە کە دەفەرموێت: ﴿ وَفِي ٱلسَّمَآءِ رِزۡقُكُمۡ وَمَا تُوعَدُونَ ﴾ الذاريات: ٢٢، خەریکە وامان لێ دێت، گاڵتەمان بەو کەسە دێت، کە پێمان دەڵێت: (مەترسەو خودای میهرەبان فەرامۆشت ناکاتو ڕزقت دەدات)، وەك ئەوەی شتێکی خەیاڵیمان پێ بڵێت، بەدەمییەوە پێدەکەنینو دەست بە بۆڵەبۆڵکردن دەکەین، بەڵام وریا بن! هەرگیز نەمانگوتووە ناشڵێین مرۆڤ هۆکارەکان فەرامۆش بکات! بەڵکو دەڵێین: با ئیدی ژیرانە بیر بکەینەوەو هەر شتەو ئاستی خۆی پێ بدەین، بزانە کە خودایەك هەیە خوڵقێنەرو کاربەدەست بەسەر هەموو دروست کراوەکاندا، هەر ئەوە هۆکارەکان فەراهەم دەهێنێت؛ تا خزمەتمان بکەن! کەوابوو: با بەدوای هۆکارەکاندا بگەڕێینو تەوەکولمان بە خودا هەبێتو دڵنیا بین لەوەی خودایە ڕزقدەرمان، نەك هۆکارەکان.

ئازیزم، هەڵەین گەر وا بزانین، دەریا ماسی دەژێنێت! نا، دەریا تەنها هۆکارێکە فەراهەمهێنراوە؛ تا بەردەوامی بدات بەژیانی ماسییەکان! ئەو خودی ژیانەکە نییەو ناشتوانێت ژیاندەری ماسییەکان بێت، گەر ویستی خودای لەسەر نەبێت.

ئازیزم، ئەم ئەزموونە تاقی بکەرەوە، گەر هێشتا لەگەڵمدا نیت: هەرکات توانیت سەردانی چێشتخانەیەکی خۆش بکەو بەویستی خۆت خواردن داوا بکە لە پێشوازیکارانی چێشتخانەکەو پاش تەواوبوونی خواردنەکەت، بڕی پارەی تێچوەکە هەمووی ببەخشە بەو پێشوازیکەرەی خواردنەکەی بۆ هێناویتو بڵێ: مادام تۆ بۆت هێنام ئەوە پارەکە موڵکی تۆیە.

دڵنیابە، هەر بە چوونە دەرەوەت لە چێشتخانەکە، کابرای خاوەن چێشتخانە، هاوارت لێ دەکاتو دەڵێت: بەڕێزم پارەت نەداوە!! باشە دەتوانیت بڵێت پارەم داوە؟ نەخێر؛ چونکە ئەوەی خواردنەکەی پێشکەش کردوویت، ئەو کەسە نییە کە خواردنەکەی بۆ دروست کردوویتو ئەو شوێنو کەشە ئارامەی بۆ دروست کردوویت کە تێیدا نان بخۆیت. بۆیە بەم کارەت وەك دزێك دێیتە پێش چاو، ناشتوانی بەو بڕە پارەیەی داوتە، هەقی نانخواردنەکەت بدەیت!

کەوابوو: بەسە چیتر سپڵەیو پێنەزانینمان بەو بەخششانەی خودای بە میهرمان پێمان دەبەخشێو پێی بەخشیوین!

با بەسبێت هێندە لەهەوڵی گەورەکردنی شتانێکداین کە شایەنی گەورەکردن نینو شتانێکیش بچووك بکەینەوە، کە شایەنی گەورەکردنن!

با بەسی بکەین، هێندە خۆ تەسلیمکردنمان بە مادیەتەوەو پشتگوێخستنمان لە تەوەکولبەستنمان بە خوداوەندەوە.

با لەوە دڵنیابین، دڵئارامیی هەمیشەییمان لە دڵ پەیوەستبوونمانەوەیە بە خوداوەندمانەوە، دڵنیا بن ئەوەی هەمانە، دەیبینین لە ماڵو سامان لە وەچەو خێزان لە ناوداری ناوبانگ دەرواو نامێنێت، تەنها ئەوانە دەیبەنەوە، دڵی خۆیان نەدۆڕاندوە بۆ مادیەتی دونیا، ژیرن لە سوودوەردەگرتن لە دونیا بەجۆرێك قیامەتیشی پێ دەبەنەوە.



# ١٠ ههنگاو بۆ ڕهخنهگرتنی بنیاتنهرو سهركهوتوو

ئهكرهم ئهحمهد

١. بهو كهسهی مهبهستته لهبارهی ڕووداوهكه، یان ئهو ههڵسوكهوتهی، یان ئهو شێوازی گهیاندنهی تووشی دوودڵی كردیت، بڵێ:

ئهم بهیانییه، له كۆبوونهوهی كارمهنداندا، له وهڵامدانهوهدا پهلهت كرد، له كاتێكدا بهڕێوهبهری گشتی، لهبارهی ئهنجامی ههڵسهنگاندنی توانای كارمهندهكان قسهی كرد، لهگهڵ ئهوهشدا من گرنگیم به وهڵامدانهوهی دا.

٢. بهو كهسهی مهبهستته بڵێ: چۆن دهكرێت بۆ ئهم ڕووداوه، یان ههڵسوكهوته، یان گهیاندنه سهربكێشێت بۆ كێشهنانهوه.

"سهرنجم دا لهو تێڕوانینه سهیرهی لهسهر ڕووی بهڕێوهبهر چهند سهرسام بوو، كهواته: لهبهرچی من كه بهرپرسی ڕاستهوخۆی دوای بهڕێوهبهرم ڕێگا به یهكێك له كارمهندهكانی خۆم بدهم، كه وهڵامی ئهو پرسیاره بداتهوه، كه بهڕێوهبهر كردی. لهگهڵ ئهوهشدا من دهمویست بهو شێوازه زانیارییهكانی پێشكهش بكهم، كه ئهو پێشكهشی كرد.

٣. ههستی خۆتی سهبارهت بهو ههڵوێسته بۆ دهرببڕه: من لهبهردهم بهڕێوهبهردا، ههستم به شهرمهزاری كرد، ههروهها بێهوا بووم، لهبهرئهوهی منو تۆ نهمانتوانی پێكهوه ڕێك بكهوین، تا ڕێ لهو شتهی ڕووی دا بگرین.

٤. داوای لێ بكه، ههر شتێك وا دهردهكهوێت تۆ لێی تێ ناگهیت، ڕوونی بكهرهوه: "بۆچی قسهت كردو كارهكهت بۆ من جێ نههێشت؟" پاشان گوێ بۆ وهڵامهكهی بگره.

٥. لهو جۆره ههڵوێستانهدا، پێشنیاری ڕاستكردنهوه بكه: با ڕێ بكهوین، سهرهتا من دهبمه بهرپرسی ئهو ڕاپۆرتانهی سهبارهت به ههڵسهنگاندنی چۆنێتیی كاری كارمهندان؛ تا له كۆبوونهوهیهكی دیاریكراودا، بڕیار به پێچهوانهی ئهو كاره نهدهم.. با له كۆبوونهوهی كارمهنداندا بهرامبهر بهیهك دابنیشین؛ تا بتوانین وهك نموونهیهك بۆ ههڵوێستهكانی تر، ئاماژهكان به خێرایی ئاڵوگۆڕ بكهین.

٦. ئهگهر ههڵوێستهكان دهكرا ڕاست بكرێنهوه، له پرۆسهی چارهسهری كێشهكهدا، بهشداریی پێ بكه: لێی بپرسه: ئایا بیرۆكهی ترت لایه؟ یان چاكتر وایه پێی بڵێیت: ئایا دهكرێت ڕێگربین له ڕوونهدانی بۆ جارێكی تر؟

٧. گرنتی پابهندبوونی لێ وهردهگرم، بۆ جارێكی تر؛ تا ئهو كاره له داهاتوودا دووباره نهبێتهوه:

"ئایا هاوڕای لهگهڵمدا، كه ئهمهی گوتم، باشترین ڕێگای ڕێگهی لێك تێگهیشتنه، تێیدا له ڕێی كۆبوونهوهی كارمهندهكانهوه؟ ئایا هیچ گرفتێك، له جێبهجێكردنیدا بهدی دهكهیت؟

٨. بهو كهسه بڵێ: لای من، زۆر بهڕێزیت: تۆ بۆ ماوهی ساڵێكه، لهگهڵ مندا ئامادهی كۆبوونهوهی كارمهندان دهبیت، من ڕێزی ههوڵو ماندووبوونت دهگرم، گومانی تێدا نییه، له داهاتوودا، تۆ بهردهوام یارمهتیدهری من دهبیت.

٩. واز له قسهكانت بهێنه، با شوێنی خۆی لهناو دڵیدا بكاتهوه: باسی هیچ بابهتێكی تری لا مهكه، چاكتر وایه بهجێی بهێڵێتو قسهكانت با له گوێیدا بزرنگێتهوه

١٠. پهیڕهوی ڕێكاری ڕاستكردنهوهكان به، كه وهك ئامۆژگاریو ڕێنمایی پێت ڕاگهیاندووه: له پابهندبوون پێیهوه دڵنیابهو بهرامبهری بهئهمهك به، ههڵێك بقۆزهرهوه بۆ سوپاسكردنی كارمهندهكه له بهرامبهر ههڵسوكهوتی تازهو بهئهمهكی له بهرامبهر ئامۆژگارییهكانت.. ئهمهش هاندهرێكی باشه بۆ گۆڕینی بهرهو ئاڕاستهیهكی زۆر باش له كاركردندا.

بەرزان ئەبوبەکر




# سولەیمان عەبدولعەزیز ڕاجحی

## (١٣٥٠ - ٠٠٠٠)

ئەو کەســەی لە منداڵیدا لە شــوێنێك دادەنیشــێت، کە ڕقی لێیەتی، لە گەورەییدا لە شوێنێك دانانیشێت کە حەزی لێیەتی! عەبدوڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خودای لێبێت)

خاوەنکارو کەســایەتی ناودار ڕاجحی "چیرۆکی ئەو خاوەن فرووشــەی بوو بە خاوەنی ملیاران دۆلار".

کــەم کەس هەیە لە کەســانی خاوەن ئەزموون‌و خوێنــدەوار، ناوی ڕاجحییان نەبیستبێت، ئەو ناوەی لە زۆربەی بوارەکانی پیشەسازی، کشتوکاڵی، بانك‌و بازرگانی‌و ڕێکخراوە خێرخوازییەکاندا، ڕۆڵی سەرەکیی بینیوە، ڕاجحی کاریگەرییەکی گەورەی هەبــووەو توانیویەتی ناوی خــۆی‌و بنەماڵەکەی بگەیەنێت بە لوتکە، هاوکات براو کەسانی نزیکی، لەم سەرکەوتن‌و دەستکەوتانەدا بەشدارکردووە.

ژیاننامەی (سلێمان عەبدولعزیز ڕاجحی):

ڕاجحی بازرگانی‌و خاوەنکاریی تێپەڕاند، ڕاجحی پیاوێکی گەورەو بەناوبانگی بواری بازرگانییە، کە وێنەی کەم‌و دەگمەنە، مرۆڤێکی باوەڕدارە، ئەو باوەڕەشی بووە بە چرایەك بۆ ڕووناککردنەوەی ژیانی، ڕاجحی پیاوێکی نیشــتمانپەروەرە، لە هەموو ئەو هەل‌و دەرفەتانەی بۆی ڕێ دەکەوت، هەمیشە هەوڵی بۆ خزمەتی نیشــتمانەکەی دەدا، هــاوکات پیاوێکــی بلیمەتە، چەندان داهێنــان‌و بیرۆکەی بەهێزی هەیە، خاوەنی زیرەکییەکی بێوێنەیە.

ژیاننامــەی ئەم کەڵەپیــاوە، چێژێکی تایبەتی هەیە، ژیانــی لێوانلێوە لە ســەرکەوتن‌و ئەزموون‌و هەوڵدان‌و قوربانیدان‌و ڕاستگۆیی‌و خۆشەویستی خاك‌و نیشتمانەکەی‌و حەزکردن بە خێرو چاکەکردن.

ڕاجحی ساڵی ١٣٥٠ کۆچی لە بەکیریەی وڵاتی سعودییە لە خێزانێکی هەژارو کەمدەرامەت‌و ئاینپەروەرو پەیوەســت بە ئاینی پیرۆزی ئیســلامەوە، چاوی بۆ ژیان هەڵهێناوە، ئەمەش کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر ژیانی ڕاجحی کردووە.

ئــەو کاتەی تەمەنی دەگاتە حەوت ســاڵان، خێزانەکەی ماڵ دەگوێزنەوە بۆ شــاری ڕیاز، بە مەبەســتی گەڕان بەدوای کارو پەیداکردنی بژێویی ژیان، باوکی ڕاجحی ســەرەتا دووکانێکی بچکۆلانەی کردەوە؛ بۆ فرۆشتنی جل‌وبەرگــو جبەو عەبای سەرشان، هاوکات خانوویەکی قوڕی بە کرێ گرتبوو تەنها بە یەك ڕیاڵ، کــە ئەو بڕە پارەیە بۆ ئەو ســەردەمە کەم نەبــوو، منداڵەکانی ناچاربوون بۆ یارمەتیدانــی باوکیان ڕۆژانە دارو چیلکەیان کۆ دەکــردەوەو دەیانبرد لە بازاڕ دەیانفرۆشــت؛ تا کەمێك باری سەرشــانی باوکیان ســووك بکەن. لانی کەم بۆ پەیداکردنی کرێی ساڵانەی خانووەکەیان.

ڕاجحــی هەروەکــو منداڵەکانــی دیکــەی خێزانەکەی، پەیوەندیــی کرد بە قوتابخانەوە، بەڵام هەروەکو خۆی دەڵێت: لە قوتابخانە باش نەبووم، لەبەرئەوە هــەر لــە پۆلی دووەمی ســەرەتایی وازم لە قوتابخانە هێنــا.. هەرچەندە وازی لــە قوتابخانە هێناوە، بەڵام بێکار دانەنیشــتووە، هەر لــە منداڵییەوە ڕووی لە بازاڕی کار کردووەو بەپێچەوانەی منداڵانی هاوڕێی، لە بری یاریکردن لە کۆڵان، دەستی داوەتە کارکردن‌و کاتەکانی ڕۆژانەی بە کارکردن بەسەر بردووە؛ چونکە حــەزی بە هاوکاریکردن‌و یارمەتیدانی خێزانەکەی کردووە، ڕاجحی لە تەمەنی نۆ ساڵاندا دەستی بەکارکردن کردووە، ڕۆژانە چووەتە شاخ‌و بارەداری هێناوە بۆ بازاڕو زۆر جاریش پەینی وشکی حوشتری کۆکردۆتەوەو فرۆشتوویەتی.

ســەرەتای هەموو کارێکی گەورە، لە کارێکی بچووکەوە دەســتی پێ کردووە، ڕاجحــی لەم کارە ســادەو بچووکانەوە، دەســتی بە کارکردن کــرد، بەرەو کاری گــەورەو فــراوان‌و قازانجی زیاتر هەنگاوی نا، دوای ئەو کارانە دەســتی کرد بە گواســتنەوەو فرۆشتنی گاز، قازانجی ئەو کارەی قرووش‌و نیوێك بوو، تەنەکەی گازی دەکڕی بە قرووش‌و نیوێك، بە سێ قرووشیش دەیفرۆشتەوە، ڕۆژانە لانی کەم چوار قرووش‌و نیوی دەست دەکەوت، ئەو بڕە بۆ ئەو سەردەمە یەکجار زۆر بوو، کەم کەس هەبوو بتوانێت لەو کاتەدا ئەو بڕە پارەیە پەیدا بکات.

ڕاجحــی وەکو هەر خاوەنکارێکی دیکە، لەســەر ئەم کارەشــی زۆر بەردەوام نەبوو، دواتر کارەکەی گۆڕی‌و دەســتی کرد بە هێنانی شــیرینی‌و فرۆشــتنی لە بازاڕدا، کە لەسەر سینییەك شیرنییەکەی دادەناو دەیفرۆشت، لەم کارەیدا ڕۆژانە دوو تا ســێ قرووشــی قازانج دەکرد، ڕاجحی سەرنجی دا، ئەم کارەی قازانجێکی ئەو تۆی نییە، تەنانەت کەمتر لە کارەکەی پێشووی قازانجی دەکرد، لەبەرئەوە وازی لــەو کارەش هێناو دەســتی کرد بە حەمماڵی، کەلوپەلی دەگواســتەوە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە، بەرامبەر نیو قرووش.

ڕاجحی تەمەنی گەیشــتە سیانزەســاڵی، تا ئەو کاتــە چەندین کاری گۆڕی، لە هەر کارێك ئەزموونێکی وەردەگرت‌و گەشــەی بە تواناکانی دەدا، لەو کاتەدا واتە: لە سیانزەســاڵیدا دەستی کرد بە کڕینی بەروبوومی جوتیارەکان‌و دەیبرد بۆ بازاڕ دەیفرۆشــت، هەروەها یەکێك لە کارەکانی ئەو کاتەی ڕاجحی، ئەوەبوو کــە فڕۆکەی منداڵانی لە گەڵای دارخورما درووســت دەکردو دەیفرۆشــت، ئەو بیرۆکەیەشــی لەوەوە بۆ هات کە بینی پیاوێکــی بە تەمەن، ئە جۆرە فڕۆکانە دەفرۆشــێت، دانەیەکی بە یەك قرووش لێکڕی‌و هەڵی وەشاند؛ تا بزانێت چۆن درووســت کــراوە، دوای ئەوەی زانی چۆن درووســت کراوە، گــەڵای دارخورمای کۆکردەوەو دەیفرۆشتەوە تەنها بە نیو قرووش.

ڕاجحی بەردەوام بوو، لەسەر گۆڕینی کارەکانی، بە هیوای ئەوەی ئەو کارەی دەیەوێــت بیدۆزێتەوە، وەك کارکردن لە چێشــتخانەو چایخانەو چەندین کاری دیکەی گۆڕی، هەموو ئەمانەش پێویســتە لەسەر مرۆڤی خاوەنکار؛ تا بتوانێت کارێك بدۆزێتەوە کە لەگەڵ شکۆو شەوکەتیدا بگونجێت، بۆئەوەی ڕێگەیەوە بە کەمترین ماندووبوون، ئەوپەڕی قازانج بکات.

تەمەنی ڕاجحی گەیشــتە ١٨ ساڵان، خێزانەکەی پێداگرییان کرد کە دەبێت هاوســەرگیری بــکات، ســەرەتا ڕاجحــی ڕازی نەبــوو، بە بیانووی ئــەوەی کە دەبێت ســەرەتا کەســێتیی خۆی بنیــات بنێ‌و خۆی ئامادە بکات بۆ پڕۆســەی هاوســەرگیری، بەڵام دوای ئــەوەی دایکی زۆر پێداگری کــرد، ڕازیبوو، ڕاجحی داهات‌و پارەو ســامانەکەی کۆ کردەوە؛ تا بتوانێت مارەیی‌و خەرجیی پڕۆســەی هاوسەرگیرییەکەی بدات، هەموو ئەوەی کۆی کردبوویەوە، جگە لەوەی خەرجی کردبــوو بۆ بژێــوی خانەوادەکەی، بــۆ مارەیی‌و خەرجی هاوســەرگیرییەکەی بەکاری هێنا، ئیدی ڕاجحی گەڕایەوە خاڵی سفر. واتە: دەبێت جارێکی دیکە، لە سفرەوە دەست پێ بکاتەوە.

یەکێك لە براکانی ڕاجحی، پێشنیاری بۆ کرد، کە لە دوکانی پارەگۆڕینەوەکەی ئەودا کار بکات، مانگی بە ١٠٠٠ ڕیال، هەروەها خەرجیی خۆی‌و هاوسەرەکەشــی دەکێشێت، ڕاجحی بە پێشنیارەکە ڕازیبوو، بەو کارەو بەو بڕە پارەیە کاروباری ژیانیان گەلەك باشبوو.

دوای ئەوەی ڕاجحی بڕێك پارەی باشی کۆ کردەوە، بوو بە هاوبەشی براکەی لە دووکانی پارەگۆڕینەوەکەدا، دواتر کارەکەی زیاتر پەرەی ســەند، بڕیاریان دا بانکێك درووســت بکەن، یەکەم بیرۆکەش کە بــە خەیاڵیاندا هات، ئەوەبوو کە چۆن بەپێی شەریعەتی ئیسلامی، کاری ئاڵوگۆڕی دراو بکەن، بە پشتبەستن بە

خودا، دەستیان بە کارەکەیان کردو بانکەکەیان دامەزراند، کە گرنگترین خاڵی بنەڕەتی بوونی دەستەیەکی چاودێری شەرعی بوو، بەسەر کارەکانیانەوە، کە مافیان هەبێت دەستوەربدەنە هەموو کاروبارێکی بانك، بەشێوەیەك کە هیچ کارێك، یان هیچ بڕیارێك لەو بانکەدا ئەنجام نەدرێت، بەبێ فەتواو مۆڵەتی دەستەی چاودێری.

یەکێکی دیکە لە دەستکەوتە گەورەکانی ڕاجحی، دامەزراندنی کێلگەیەکی پەلەوەریی نیشتمانی بوو، ئەم پرۆژەیەی بووە گەورەترین پرۆژە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، ڕاجحی باس لە کێلگە پەلەوەرییەکەی دەکاتو دەڵێت: جارێکیان سەردانی کێلگە پەلەوەرییەکەم کرد، بینیم زۆرێك لە مریشکەکان پێش سەربڕین مردار دەبنەوە، واتە: پێش ئەوەی سەرببڕدرێن بە هۆی بەکارهێنانی ئامێری سەربڕینەوە مردار دەبنەوە، ئەوەش پێچەوانەی ئاینی پیرۆزی ئیسلامە، کاتێك داوای ڕوونکردنەوەم لەو بارەیەوە کرد، کرێکارانی کێلگە پەلەوەرییەکە پێیان ڕاگەیاندم، کە ئەگەر دانە دانە بە دەست مریشکەکان سەرببڕین قازانج ناکەین.

بەڵام ڕاجحی دژی بۆچوونەکەیان وەستاو بڕیاری دا، کە دەبێت دانە دانە مریشکەکان سەرببڕدرێن، بەپێی ڕێنمایی ئایینی پیرۆزی ئیسلام، هەرچەندە قازانجیش نەکاتو زیانیش بکات، لای ڕاجحی گرنگ ئەوەیە پێچەوانەی ئاینی ئیسلام کار نەکاتو فێڵو تەڵەکە لە کارەکەیدا نەکاتو ڕاستگۆیانەو بەپێی شەریعەت کارەکانی ئەنجام بدات.

ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە ئەو کێلگە پەلەوەرییە ببێت بە کێلگەیەکی پەلەوەریی نیشتمانیو قازانجنەویست، جگە لەوەش زیانەکانی گەیشتە یەك ملیار ڕیاڵ، بەڵام لەبەرئەوەی ڕاجحی نییەتی پاك بوو، لە کارەکەی دا فێڵو تەڵەکەو حەرامی قبووڵ نەبوو، هەر زوو خودا یارمەتی داو زیانەکانی بەرەو کەمبوونەوە دەڕۆیشت، بەشێوەیەك لە ساڵی یەکەمدا زیانەکانی بە ٥٠ ملیۆن ڕیاڵ هەژمار کرا، بەڵام ساڵی دووەم بووە ٤٠ ملیۆن ڕیاڵو ساڵی سێیەم ٣٠ ملیۆن ڕیاڵو دواتر ٢٠ ملیۆنو تا وای لێهات بە تەواوی زیانەکان کۆتایی هاتو کارگەکەش کەوتەوە سەر قازانج، تا بووە یەکێك لە گەورەترین کێلگەی پەلەوەری لەسەر ئاستی جیهان.

یەکێکی دیکە لە سەرکەوتنەکانی دوای ئەوە دێت، کە دەستی کردە پرۆژەی کشتوکاڵی، کە بڕیاری داو بەڵێنی دا کە سەرجەم بەرهەمەکانی لە سەدا سەد سرووشتی بنو هیچ ماددەیەکی کیمیاییان تێکەڵاو نەکات، لەگەڵ ئەوەشدا کە کرێکارانو ئەندازیارانی کارگەکەی هاوڕا نەبوون لەگەڵیدا، بەڵکو پێیان وابوو کە ئەو بڕیارە دەبێتە هۆی هەرەسهێنانی پرۆژەکەیو هیچ قازانجێکی ئابووری تێدا ناکات، بەڵام ڕاجحی لەسەر هەڵوێستەکەی سوور بوو، هاوکات هەر بەو شێوەیە بوو کە ڕاجحی پلانی بۆ دانابوو، پرۆژەکەی زۆر بەباشی بەڕێوەچوو، یەکێك لە بەرهەمەکانی کارگەکەی زەیتی زەیتوون بوو، کە بوو بە یەکەم مەڵبەندی جیهانی، کە باشترینو زۆرترین زەیتی زەیتوونی لە جیهاندا بە شێوەیەکی زۆر سرووشتی بەرهەم دەهێنا. تەنانەت پێشبڕکێی بەرهەمی ئیتاڵیای دەکرد.

بەڵام ئەم بارودۆخە زۆر درێژەی نەکێشا، ئەندازیارانی کشتوکاڵی زیندەوەرێکی زیانبەخشیان دۆزییەوە لە نێو بەرهەمەکاندا، ئەو کات ناچاربوون دەرمانی دژە زیندەوەرە زیانبەخشەکان بەکاربهێنن، کە لە ماددەی کیمیایی دروست کرابوون، ئەم هەواڵەشیان بە جەنابی ڕاجحی گەیاند، بەڵام ئەو زۆر بەتوندی لە دژی بڕیارەکەیان وەستایەوەو ئەوەی بە فێڵکردن لە خەڵکی وەسف کرد، ئەو گوتی: ئێمە چۆن دەتوانین بە خەڵکی بڵێین: بەرهەمەکانمان لە سەدا سەد سرووشتین، لە کاتێکدا دەرمانی کیمیایی دژە زیندەوەرە زیانبەخشەکان بەکاربهێنین؟

ڕاجحی لەسەر هەڵوێستەکەی سووربوو، ئەندازیارەکانیش لەسەر هەڵوێستەکەی خۆیان سووربوون، بەڵام دواجار هەڵوێستی ڕاجحی سەرکەوت، ئەندازیارو کرێکارەکان ملکەچی بڕیارەکەی ڕاجحی بوون، بەو پێیەی ڕاجحی خۆی خاوەنی پرۆژەکەیە، خاوەنی بڕیاری یەکەمو یەکلاکەرەوە ڕاجحییە، زەرەرو قازانج هەر دەگەڕێتەوە بۆ لای ئەو، بەڵام ئەوەی جێگەی سەرسوڕمان بوو ئەوەبوو کە دوای چەند ڕۆژێك ئەندازیارەکانی پەیوەندییان بە ڕاجحییەوە کردو پێیان ڕاگەیاند کە زیندەوەرێکی دیکەیان دۆزیوەتەوە لە کارگەکەیدا، بەڵام ئەم زیندەوەرە زیان بە بەرهەمەکان ناگەیەنێت؟ ئەی دەبێت چی بکات؟

لە وەڵامدا گوتیان: ئەم زیندەوەرە زیندەوەرەکەی پێشوو لەناو دەبات، کە بڕیار وابوو دەرمانی لە دژ بەکار بهێنین، هەروەکو ئەوەی خودای گەورە بەتایبەت لەبەر نیەتپاکیو کارە باشو ڕاستگۆییو بێفڕوفێڵەکانی ڕاجحی، ئەم زیندەوەرەی ناردبێت بۆ لەناوبردنی زیندەوەرە زیانبەخشەکان!

- یەکێکی دیکە لە پرۆژە گەورەکانی ڕاجحی، دروستکردنی کێلگەی ڕۆبیان بوو، ئەوەی لە سەرەتاوە بوو بە ئاستەنگ بۆ پرۆژەکە بریتی بوو لەوەی، چۆن خۆیان لە پاشەڕۆی ڕۆبیانەکان ڕزگار بکەن؟ ڕاجحی زۆر حەزی بە سرووشتو شتی سرووشتی هەبوو، بە هیچ کارێك ڕازی نەدەبوو کە زیان بە سرووشتو ژینگە بگەیەنێت، بۆ ئەم مەبەستە ڕاجحی دەستی کرد بە گەڕان بە جیهاندا بەتایبەت ئەورووپاو ئەمریکای باکوورو ئەمریکای لاتینی، بۆئەوەی باشترین چارەسەر بۆ کێشەی پاشەڕۆکی ڕۆبیانەکان بدۆزێتەوە.

بەڵام ڕاجحی هیچ کام لەو ڕێگایانەی بینی بەدڵ نەبوو، لەبەرئەوە بیرۆکەیەکی داهێنا بۆ چارەسەری گرفتەکە، کە بە هۆیەوە چەندین خەڵاتی بەدەست هێنا، ئەو بیرۆکەیەش بووە دەروازەیەکی چارەسەرو لە زۆربەی وڵاتانی جیهان لە کێلگەی ڕۆبیانەکاندا بەکار هات، بیرۆکەکەش بریتی بوو لە دروستکردنی کێلگەیەکی ماسیی تایبەت، کە خواردنیان پاشەڕۆی ڕۆبیانەکان بوو، بەشێوەیەك ئاویان دەڕشتبەسەر پاشەڕۆی ڕۆبیانەکانداو دواتر دەیانکردە نێو حەوزی ماسییەکانەوە، پاشان فڕێیان دەدایە دەریاوە، ئەم بیرۆکەیەش بووە جێگەی سەرسوڕمانی زۆربەی خاوەن کارگە ڕۆبیانەکانی جیهانو ئەوانیش سوودیان لێ بینیو پیادەیان کرد.

**چەند زانیارییەك لەسەر پرۆژەکانی:**

* پرۆژەی کێلگەی پەلەوەریی نیشتمانی بەگەورەترین پرۆژە ئەژمار دەکرێت لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا. هاوکات یەکێکە لە پرۆژە زەبەلاحەکان لەسەر ئاستی جیهان، لە بواری کێلگەی پەلەوەریو بابەتی خۆراکی ئاوێتەی تایبەت بە مریشكو پەلەوەر. ڕووبەری ئەم پرۆژەیە ٢٠٠ کیلۆمەتری چوار گۆشەیە، گوندێکی تەواوە بە هەموو بەشە بەرهەمهێنەکانییەوە، لەناو ئەو پرۆژەیەدا شوێنی نیشتەجێبوون، چێشتخانەو مزگەوتو ڕێگاو بانو ئاوو کارەباو هێڵی پەیوەندیو چەندین خزمەتگوزاریی دیکەی تێدایە، دروستکردنی ئەم پرۆژەیە نزیکەی ٣ بلیۆن ڕیاڵی سعودی تێچووە.

- بەرهەمی کارگەکەش ڕۆژانە دەگاتە ٥٠٠ هەزار مریشكو یەك ملیۆن هێلکە بۆ خواردن بەرهەم دەهێنێت.

بەردەوامیش کارگەکە لە فراوانبووندایە، بە پشتیوانی خودای گەورە، هەروەها دوای فراوانبوونو گەورەبوونی کارگە بەرهەمی هێلکەی کارگە ڕۆژانە گەیشتە ٣ ملیۆن..

بەم پێیە ئەم کارگەیە لە توانایدایە لە ٤٠٪ مریشك بۆ بازاڕەکانی سعودی دەستەبەر بکات.

- هەروەها لە ٢٠٪ هێلکەی خواردنی بازاڕ لە وڵاتی سعودیە دەستەبەر دەکات.

- لە ٢٠٪ بەرهەمی مریشکی کارگەکە دەنێردرێتە دەرەوەی وڵات.

بەرهەمی عەلەفی کارگەکە، ڕۆژانە دەگاتە ١٨٠٠ تەن.

- کارگەی سەماد ڕۆژانە توانای بەرهەمهێنانی ٧٠ تەن سەمادی هەیە.

شیخ سلێمان ڕاجحی سەرۆکی ئەنجومەنی بەڕێوەبردنی کۆمپانیای نادك، کە گەورەترین کۆمپانیای بەرهەمهێنانی بەرووبوومی شیرو ماستە لە ناوچەکەدا.

- بانکی ڕاجحی بە یەکێك لە بانکە وەبەرهێنە گەورەکان دەژمێرێت، کە پشکی هەیە لە وڵاتی سعودیە، بە سەرمایەی لە ١٠٠٪ کە سەرەتای کردنەوە لە ٧٥٠ ملیۆن ڕیالی سعودییەوە دەستی پێ کرد، پاشان سەرمایەکەی بووە ١٥٠٠ ملیۆن ڕیالی سعودی، دواتر بووە ٢٢٥٠٠٠٠٠٠ ملیۆن ڕیال، پاشان توانی ببێتە سێیەم گەورەترین بانکی سعودی، لە سەرەتای ساڵی ٢٠٠٦ بانکی ناوەندی مالیزی بانگێکی تەرخان کرد بۆ بانکی ڕاجحی، کە لقێکی لە مالیزیا کردەوە، بەمەش بانکەکە هەنگاوێکی گەورەی نا بە ڕووی جیهاندا.

سامانەکەی لە نێوان ٨ بۆ ١١ ملیار دۆلارە، یەکێکە لە گەورەترە دەوڵەمەندەکانی جیهان.



# بیرکردنەوەی دۆڵفینی

لە فارسییەوە: زریان مەحمود

چلۆن دەتوانین لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکاندا، ڕێچارەیەك بدۆزینەوە، کە بۆ هەموو کەسێك ڕازیکەر بێتو ئێمەش بە لێکگەیشتن بگەیەنێت؟

نووسەرانو شارەزایانی ئەم بوارە، ڕێگاری دۆڵفینی بە کلیلو ڕازی ئەم نهێنییە ئاڵۆزە دەزانن. بە گشتی مرۆڤەکانیش هاوشێوەی زیندەوەرە دەریاییەکان دابەش دەکرێن بەسەر سێ دەستەدا. ماسییە کەپوورەکان (خۆراکییەکان)، قرشەکان، دۆڵفینەکان.

دەستەی یەکەم:

ماسییە کەپوورەکان: ئەمانە هەمیشە ماسییە قوربانییەکانن؛ چونکە لەلایەن ماسییەکانی ترەوە دەخورێن. هەندێك لە مرۆڤەکانیش هاوشێوەی ئەم ماسییانەن. ئەوان کەمو زۆر بەپێی بارودۆخ، دەبنە قوربانی ئەم، یان ئەو شتە.. ئەم، یان ئەو مەسەلەیە.. ئەم، یان ئەو کەسەو تەنانەت لەوانەشە ببنە قوربانی بیرکردنەوەی هەڵەی خۆیانو بیرکردنەوەی نەرێنیی خۆیان.

دەستەی دووەم:

قرشە ماسییەکان: لە پەیوەندییەکانیاندا ڕێکارو میکانیزمی براوە-دۆڕاو هەڵدەبژێرن. بۆئەوەی کە من براوە بم؛ پێویستە تۆ بدۆڕێیت. بۆ قرشە ماسییەکان، هەرجۆرە ماسییەکی تر جگە لە دوژمنێكو ژەمێکی بەتامی خۆراك هیچ نییە. لەوانەیە هەریەکێك لە ئێمەش، جاروبار ئەم ڕۆڵەمان گێڕابێتو یانیش هیچ نەبێت ڕووبەڕووی مرۆڤگەلی قرشی مەرامی بووبینەوە. وەك ئەو کەسانەی کە بۆ دەستراگەشتن بە مەقامی بەرزتر، ئامادەن بەرامبەرو چواردەوریان لەناو ببەن!

دەستەی سێیەم:

دۆڵفینەکان: جۆرێکی تری زیندەوەرە دەریاییەکانن. ئەم زیندەوەرە ئاوییانە، خاوەنی گیانی هاوکارینو لە پەیوەندییەکانی خۆیاندا شێوەو سیستەمی براوە-براوەیان هەڵبژاردووە. دۆڵفین هیچ کەمییەکی نییەو پێی خۆشە هەموو شتێك لەگەڵ هەمواندا بەش بکات. ئەگەر دۆڵفینێك بریندار ببێت، چوار دۆڵفینی تر هاوکاریی دەکەن؛ بۆئەوەی کە خۆی بگەیەنێت بە گرووپەکەی.

لەسانتیاگۆ، زانایانو توێژەران ٩٥ قرشە ماسیو ٥ دۆڵفینیان بۆ ماوەی یەك هەفتە کردە ناو مەلەوانگەیەکی گەورەوەو چاودێریی ڕەفتارو شێوازی هەڵسوکەتیان کردن... سەرەتا قرشە ماسییەکان هێرشیان برد بۆ یەکترو لەم هێرشەشدا ژمارەیەکی زۆریان نابود بوون. دواتر هێرشیان برد بۆ دۆڵفینەکان. دۆڵفینەکان تەنها دەیانویست یارییان لەگەڵدا بکەن، بەڵام قرشەکان بەبێ وەستان هێرشیان دەکردە سەریان. سەرەنجام دۆڵفینەکانیش گەمارۆی قرشە ماسییەکانیان داو کاتێك کە یەکێك لە قرشەکان هێرشی دەهێنا ئەوان دەیانکێشا بە ستوونی فەقەراتی، یان پەراسووەکانیداو دەیانشکاندن. بەم شێوەیە قرشە ماسییەکان یەك لەدوای یەك لەناوچوون.

دوای یەك هەفتە ٩٥ قرشە ماسی مردوو ٥ دۆڵفینی زیندوو کە خەریکی یاریکردن بوون لەگەڵ یەکتریدا، لەناو مەلەوانگەکەدا بینران.

لە دونیای قرشیدا، بۆ براوە بوون پێویستە ئەوانی تر، یان بمرن، یان بدۆڕێن.

لە دنیای دۆڵفینیدا سازان وجودی هەیەو سەرڕێژە لە ئەنجامگەلی پردەستکەوت.

ئێمەی مرۆڤیش دونیایەکی جوانترمان دەبوو، ئەگەر خاوەنی ئەم بیرکردنەوە جوانانە بووینایە.

بیرکردنەوەی دۆڵفینی واتە: ئەوەی کە:

جگە لە خۆمان بیر لە کەسانی تریش بکەینەوە. لە کاتی دەرکەوتنی کێشەکاندا، هاودڵی لەگەڵ کەسانی تردا بکەین. لە خۆشحاڵی کەسانی ترو دەوروبەردا شادو سەرحاڵ بین. لە نارەحەتیو ئازاری دەوروبەردا هەست بە دەرد بکەین. لەگەڵ دەوروبەردا هاودڵی هاوڕێیی بکەین. دەست لەناودەستی یەك بۆ سەرکەوتنی هەمووان هەوڵ بدەین. لەجیاتی ئەوەی بۆ چوونەسەرەوە بە پەیژەی سەرکەوتندا پێ بنێین بە کەسێکدا، دەستێکی تر بگرینو لەگەڵ خۆماندا بیبەینە سەرەوە، کە بەدڵنیاییەوە لەم کاتەدایە لەسەرەوە دەستێکی تریش هەیە کە دەستمان بگرێت.

هاوکاری، هاودڵی، هاوڕێیی، هاوفکری...هەموو ئەو کارانەی کە بە ئەنجامدانیان، هەم کۆمەکمان بە خۆمان کردووەو هەم کۆمەك بە دەوروبەریش.

لەبەرئەوە با کەمێك ڕابمێنین...

کەمێك بجووڵێینو تەکانێك بەخۆمان بدەین...

کەمێك بیر بکەینەوە...

لەوانەیە بە کەمێك ڕامان، تەکانو گۆڕانکارییەکی ئیجابی لە بیرکردنەوەکانماندا دروست ببێت.

لەوانەیە بیرکردنەوەکانمان، ببن بە بیرکردنەوەی دۆڵفینی...

ئەوکات جی ڕوو دەدات...

لەبەرئەوە تکایە با کەمێك ڕابمێنین...

دوژمنی زانین، نەزانی نییە، بەڵکو بردنی گومانی خراپە!



# دایکی نموونەیی

سایە

ئافرەتێك تەمەنی نزیکی پەنجاکان بوو، هەموو بەیانییەك دەستی منداڵە بچووکەکانی دەگرتو تا دەرگای قوتابخانە دەیبردن، تا دڵنیا نەبووایە کە بەسەلامەتی گەیشتوونەتە ئەو دیو دەرگای قوتابخانە جێی نەدەهێشتن، پاشان لە کاتی گەڕانەوەیان بە نزیکەی کاتژمێرێك پێش کاتی دیاریکراو چاوەڕوانی دەکردن، زۆر بەسۆزو ڕێزەوە باوەشی پێدا دەکردنو ڕوخساری ماچ دەکردنو پێکەوە دەگەڕانەوە بۆ ماڵەوە، ئەو خانمە بەشێوەیەکی زیاد لە پێویست گرنگی دەدا بە منداڵەکانی، ڕۆژانە جلوبەرگی بۆ ئوتو دەکردنو لە کاتو ساتی خۆیدا نانی بۆ ئامادە دەکردنو سەرجەم پێداویستییەکانی قوتابخانەی بۆ دابین دەکردن، وانەکانی بۆ دووبارە دەکردنەوەو سەرپەرشتی تەواوی ئەرکەکانی قوتابخانەی دەکردنو هەموو شتێکی دەکرد؛ بۆئەوەی منداڵەکانی پەروەردەیەکی دروستیان هەبێت.

بەپێی پێویست سەردانی خوێندنگەی منداڵەکانی دەکردو لای هەر یەك لە مامۆستاکانیان بەوردی هەواڵی هەڵسوکەوتو تواناو زیرەکی منداڵەکانی لە وانەکاندا دەپرسی، زۆرجاریش چاوەڕێی مامۆستاکانی دەکرد، هەتا لە وانەکەیان تەواو دەبوونو پاشان لە کاتی پشووەکاندا دەڕۆیشتە لایانو هەواڵی نمرەو ئاستو توانای زانستیو ڕەوشتی منداڵەکانی دەپرسی، خۆ ئەگەر یەك لە منداڵەکانی تەنها یەك نمرەی، یان نیو نمرەشی کەمتر لە نمرەی تەواو بەدەست بهێنایە، تەواو نیگەران دەبوو لێیانو سەرزەنشتی دەکردنو هاوکات هانی دەدان؛ تا لە تاقیکردنەوەی داهاتوو نمرەی تەواو بەدەست بهێنن.

ئەو ساڵ جیاوازتر لە ساڵانی دی، منداڵێکیان لە پۆلی یەکی بنەڕەتی بوو، ئەو ساڵە چوو بووە خوێندن، زۆر ڕۆژ دەبوا لەبەردەم پۆلەکەی دابنیشتایە؛ تا دەوام تەواو دەبوو، چاوەڕوانی منداڵەکەی بکردایە. هەموو ڕۆژێك لەسەر کورسییە تەختەکە دادەنیشت، تا کۆتایی دەوام، ڕۆژێکیان کارگوزارەکە بەزەیی بەم خاتوونەدا هاتەوە کە ئەو هەموو کاتە لەسەر کورسییەکی تەختە دابنیشێت، لەبەرئەوە کورسییەکەی بۆ گۆڕی بە کورسییەکی پلاستیك، خانمەکەش بە دەنگێکی نزم زۆر سوپاسی کارگوزارەکەی کرد.

ڕۆژەکانی ساڵ تێپەڕین، تا هاتنی ڕۆژی دایکی نموونەیی، بەڕێوەبەری قوتابخانە بڕیاری دا کە خەڵاتی دایکی نموونەیی ببەخشرێتە ئەو ئافرەتە ماندوونەناسە.. ئەو ئافرەتەی بەدرێژایی دەوام بە دیار منداڵەکانییەوە ڕادەوەستێت، بەردەوام پرسیار لە هەڵسوکەوتو خوو و ڕەوشتو ئاستی زانستی منداڵەکانی دەکات، منداڵەکانی بە جوانترین شێوە پەروەردە کردووە..

بۆ ئەم مەبەستە مامۆستایەکی نارده لای ئەم خاتوونەو دوای سڵاوکردنو هەواڵپرسین پێی ڕاگەیاند، کە بەڕێوەبەر بڕیاری داوە خەڵاتی دایکی نموونەیی ئەم ساڵ، پێشکەش بە بەڕێزتان بکرێت؟ خانمی میهرەبانو ماندوونەناس، بەسەرسامییەوە ئاوڕی دایەوەو گوتی: من؟!

مامۆستاکەش گوتی: بەڵێ تۆ خانمی میهرەبان؛ چونکە تۆ شایەنی ئەو خەڵاتەی! خانمە میهرەبانەکە بە دەنگێکی تێکەڵ بەخەمو پەژارەو بە هەناسەیەکی قووڵەوە گوتی: بەڕێزم من تەنانەت دایکیش نیم؛ تا شایەنی ئەو خەڵاتە نایابە بم!

مامۆستاکە بە بیستنی ئەو قسانە سەرسام بوو، گوتی: مەگەر تۆ هەموو ڕۆژێك لەگەڵ منداڵەکانت نایەیت بۆ قوتابخانە؟

خانمی میهرەبان، بە گەرووی پڕ لە هەنسکو چاوی پڕ لە ئەسرینەوە گوتی: من ئافرەتێکی نەزۆکم! هاوسەرگیریم لەگەڵ هاوسەرەکەمدا کردووە، دوای ئەوەی خێزانی یەکەمی کۆچی دوایی کردووە، کە دایکی ئەم منداڵانەیە، کە من ئێستا سەرپەرشتییان دەکەم! من دوای ئەوەی هاوسەرگیریم کرد بەڵێنم دا، کە ببمە دایك بۆ ئەم منداڵە بێدایکانە، دایکێك بە مانای وشە دایك بێت، نەك دایکێکی ئاسایی، لە ناخەوە وەکو جەرگی خۆم خۆشم دەوێن، ئەوانیش منیان خۆش دەوێتو هەموان بە دایەگیان بانگم دەکەن.

هەرگیز ناتوانم لێیان دوور بکەومەوە؛ چونکە ئەوان ژیانی منن، من هەموو تەمەنم بەتەواوی لە پێناوی ئەواندا دەژیم.

ماڵەکەم بێ ئەوان تاریکستانە، ناتوانم بێ ئەوان ئارام بگرم لە ماڵ، لەبەرئەوە زۆر گرنگییان پێ دەدەمو هاوشێوەی منداڵی خۆم بەخێویان دەکەمو ناهێڵم بێدایکییان پێوە دیار بێت.

لەبەرئەوە سەعاتەکان دەژمێرم، تا ئەو کاتەی هەمووان لە قوتابخانە دەگەڕێنەوە ماڵ، بە گەڕانەوەیان زۆر شادومان دەبم، بەڵام بیبوورن من شایستەی ئەو خەڵاتە نیم؛ چونکە من دایك نیم.. مامۆستاکە ئەم قسانە زۆر کاری لێ کرد، بەپەلەو هەڵەداوان ڕۆیشت بۆ لای بەڕێوەبەر، چیرۆکەکەی بۆ گێڕایەوە، چیرۆکەکە زۆر کاری لە بەڕێوەبەر کرد، دەستبەجێ هەستایە سەرپێو خەڵاتەکەی هەڵگرتو ڕۆیشت بۆ لای خانمە میهرەبانەکەو بەدەستی خۆی دیارییەکەی پێشکەش کردو گوتی: تەنها تۆ شایەنی خەڵاتی دایکی نموونەیی!

بێگەرد فارس



# چەند قەرزاری هاوسەرەکەتی؟!

هاوسەری ئەندازیارێکی پترۆڵ، گیانی لە دەست داو سێ منداڵی لە دوای خۆی بەجێ هێشت، گەورەکەیان لە قۆناغی سێی سەرەتاییو بچووکەکەی دوو ساڵان بوو، پاش گوشاری خانەوادەکەی؛ بۆئەوەی هاوسەرگیری بکات، لە دەرگای چەندین ماڵی دا، بەڵام هیچ یەکێک لەوان ئامادە نەبوو خۆی بخاتە بەردەم بەرپرسیارێتییەکی ئاوا گەورە، بەتایبەتی ئەو بەهۆی کارەکەیەوە زۆربەی کات لە دەرەوە بوو.

پاش شکستهێنانی لە هاوسەرگیریی دووەمیو شکستی بەردەوام لە وەرگرتنی مۆڵەت لە کارەکەی، بڕیاری دا دایەنێک بۆ منداڵەکانی بگرێت؛ بۆئەوەی لەلایان بمێنێتەوەو چەند مەرجێکیشی بۆ دانا کە دەبێت ئەو دایەنە دەرچووی زانکۆ بێتو زمانی ئینگلیزی بزانێتو تەمەنی لە ٤٥ ساڵ گەورەتر نەبێت؛ تا بتوانێت بەباشی خزمەتیان بکات.

ئافرەتێک کە لە سییەکانی تەمەنیدا بوو، دەستپێشخەریی کرد لە وەرگرتنی ئەو کارەو گوتی: من دەرچووی زانکۆمو زمانی ئینگلیزیو فەرەنسی بەباشی دەزانم، من ئەو کارە وەردەگرم لەبەرئەوەی پێویستم بەپارەیە، بەڵام منیش مەرجم هەیە پێویستە موچەکەم مانگانە ٢٠٠٠ جونەیهـ بێت بۆ چاودێریی سێ منداڵەکەت، واتە: تەنها بەرپرسم لە خەواندنو هەڵسانیانو خواردن پێدانیانو خاوێنکردنەوەیان، ئەگەر دەتەوێت وانەیان پێ بڵێم پێویستە بڕی ٣٠٠ جونەیهم بۆ زیاد بکەیت، ئەگەر دەتەوێت خواردنیان بۆ ئامادە بکەم؛ ئەوا دەبێت بڕی ٤٠٠ جونەیهم بۆ زیاد بکەیت، بەمەرجێک خۆت پێویستییەکانیان لە بازاڕ بۆ بکڕیتو ئەگەر دەتەوێت تەنها جلوبەرگی منداڵە ساواکە بشۆم، ٢٠٠ جونەیهی زیاترم دەوێت، ئەگەر یەکێک لە منداڵەکانت نەخۆشییەکی دیاریکراوی هەیەو پێویستی بە چاودێریی تایبەت هەیە؛ ئەوا ٣٠٠ جونەیهی تر زیاد بکە، بۆ خاوێنکردنەوەی ماڵو چاودێریی خۆتو منداڵە گەورەکانت؛ ئەوا من بەرپرس نیم پێویستە خزمەتکاریان بۆ بگریت، ڕۆژی هەینیش لە هەفتەکەدا پشووم بێتو بەهیچ شێوەیەکیش پەیوەندیم پێوە نەکەیت، مەگەر بارودۆخێکی زۆر پێویست بێتو ناچاربیت!!

### ئێستە چەندە قەرزاری هاوسەرەکەتی؟

دەزانیت بۆچی خودای گەورە لە پێناویدا بەڵێنو پەیمانێکی وا گەورەی لێ وەرگرتوویت؟

هاوسەرەکەت بەرامبەر خزمەتکردنی خۆتو منداڵەکانت داوای پارەی مانگانەت لێ ناکات، بەپێچەوانەوە بەوپەڕی توانایەوەو بە خۆشەویستییەوە کارەکان دەکات بۆ بەدەستهێنانی زەردەخەنەیەک بە ڕووی داو پێی بڵێیت "دەستەکانت خۆش بێت"، یان ستایشکردن لەلای ئەو گەورەترین خەزێنەیە، بۆیە بەجۆرێک مامەڵەیان لەگەڵ بکە، وەک ئەوەی پێتخۆشە چۆن مامەڵە لەگەڵ کچەکانتدا بکرێت لە ماڵی هاوسەریاندا، چۆن کچەکەت بەلاوە گرنگە؛ ئەوا هاوسەرەکەشت لەلای باوکی گرنگەو ڕۆژێک لە ڕۆژان شازادە نازداری ماڵی باوکی بووە.

پێغەمبەر "درودو سڵاوی خوای لێ بێت" لە گوتاری ماڵئاواییدا، پیاوانی ڕاسپارد کە لەگەڵ خێزانەکانیان باش ڕەفتار بکەنو باشترین کەسی بەوە ناساندووە، کە لەگەڵ خێزانەکەیدا باش بێتو ئەوانی بە مرواری لێکچوواندووە هەروەک فەرموویەتی "رفقا بالقوارير"



ئا: لیندا کامەران

# ١٠ کورتە پەیامی بچوک

١. خۆت بە دوور بگرە لە تووڕەیی؛ چونکە تەنهاو تەنها ئازاری خۆت دەدات.

٢. ئەگەر تۆ ڕاست بیتو لەسەر هەق بیت، هیچ پێویست ناکات، خۆت تووڕە بکەیت. ئەگەر هەڵەش بیت؛ ئەوا مافی ئەوەت نییە، خۆت تووڕە بکەیت.

٣. بەسەبریو ئارامبوون لەگەڵ کەسوکاردا خۆشەویستییە، بەسەبربوون لەگەڵ کەسانی دیکەدا نیشانەی ڕێزە. بەئارامبوون لەگەڵ خودی خۆت هێمای بڕوابەخۆبوونە. بەئارامبوون لەگەڵ خوداوەند بەڵگەی باوەڕە.

٤. هەرگیز بیر لە ڕابوردوو مەکەوە؛ چونکە فرمێسک بۆ چاوانت دەهێنێت. بیر لە داهاتوو مەکەرەوە؛ چونکە تووشی ترس دەبیت. بەزەردەخەنەوە لەم ساتەدا بژی؛ ئەوا سەلامەتیو ئارامشت پێدەبەخشێت.

٥. هەموو تاقیکردنەوەیەك لە ژیانماندا، یان خراپترمان دەکات، یاخود باشترمان دەکات. هەموو کێشەیەك کە دێتە سەر ڕێگەمان، یان درووستمان دەکات، یاخود تێکمان دەشکێنێت. هەڵبژاردنەکە لەدەستی خۆمانە، کە ئایا دەمانەوێت ببین بە قوربانی، یاخود ببینە کەسێکی سەرکەوتوو و بەهێزتر.

٦. ئەوە بزانە کە شتە جوانەکان، هەمیشە باش نین، بەڵام شتە باشەکان هەمیشە جوانن.

٧. دەزانیت بۆچی پەروەردگار بۆشایی لەنێوان پەنجەکانی دەستتدا درووست کردووە؟ لەبەرئەوەی ئەو کەسەی تایبەتە بە تۆ، ڕۆژێك دێتو ئەو بۆشایی یانەی نێوان پەنجەکانت پڕدەکاتەوە بە وەی دەستت دەگرێت بەرەو سەرکەوتنو خۆشبەختی.

٨. بەختەوەر دیاربوون وات لێ دەکات جوانو شیرین بێیتە بەرچاوان، بۆیە تا دەتوانیت بەختەوەر بە.

٩. خوداوەند هەمووانو هەموو شتێکی بە دوان ناردووە بۆ ئەم جیهانە، کەسێك، شوێنێك بەتایبەت بۆ تۆ درووست کراوە، بۆیە چاوەڕێ بە بۆ هاتنی کاتو شوێنی ڕاستو درووست دیاریکراو.

١٠. هەموو ئەو شتانەی کە پێویستن، دێن بەرەو ڕووت، لە باشترینو شیاوترین کاتدا.

ئەبوبەکر سەعید



سـەرلەبەیانی ڕۆژی هەینییە، مرۆڤە باوەڕدارەکان سەرقاڵی خۆئامادەکردنـن بۆ بەجێگەیاندنی مەراسـیمی نوێژی هەینی. کامـەران گەنجێکـی خوێنگەرمی بـاوەڕدارە، وردە وردە بەرەو مزگەوت بـەڕێ دەکەوت، لەگەڵ خوێندنـی وێردەکانی تایبەت بـەم ڕۆژە هەنگاوەکانـی تەریب دەکـرد، وەك ئاوازێکی دڵنـەواز دڵو دەروونی پێ ئاوپڕژێن دەکـرد. هێدی هێدی بەم شـێوەیە ڕێی دەکرد، تاگەیشـتە حەوشـەی مزگەوتەکە. دەنگی قورئانخوێنە نابیناکە لـە بڵندگۆی مزگەوتەکە وەك بولبولێکی خۆشخوان بەگوێی ئامادەبووانو خەڵکی گەڕەکەکە دەیچریکاند. ئـەو کەشـە ڕۆحییە، هێندەی تـر ئەوی بـەرەو جیهانێکی تر دەبرد، بەڕادەیەك کەسانی دەوروبەری وا هەستیان دەکرد، تەنها لاشەیەکی بێگیان لەسەر زەوی ماوە.

لەگەڵ گەیشـتنی قورئانخوێنەکە بەئایەتی ﴿ وَءَاتِ ذَا ٱلْقُرْبَىٰ حَقَّهُۥ وَٱلْمِسْكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ ﴾ الإسراء: ٢٦ کامـەران ئاوڕێکی لای ڕاسـتی دایەوە بینـی ئافرەتێکی تەمەن "40" سـاڵ لەچکێکی لەسەر زەوی داناوە، چەند ناسنامەیەکی لەتەك یەك ڕیز کردووە، گوزارشت بوو لەوەی کە منداڵی هەتیوی لە ئەستۆدایە. لەولاشەوە چەند منداڵێك لەپاڵییەوە بوون، یەکێکیان سووچێکی عەباکەی گرتبوو، ئەوی تر دانیشتبوو، یەکێکی تریان لەسەر زەوی خەوی لێ کەوتبوو. ئەوەی لە هەموویان بچووکتربوو مەمەیەکی بەتاڵی بەدەمـەوە بوو بـەدەم مژینی مەمەکەوە ژێـر دەبویەوە، بەڵام دڵۆپێکی شـیری تێـدا نەبوو، ناچار دووبارە دەسـتی دەکردەوە بەگریان، دیمەنێك بوو دڵی بەردئاسای دەکرد بە خۆڵەمێش، وا پێ دەچوو، ئافرەتەکە پیاوی لە ژیاندا نەمابێتو ئەو منداڵانەی هەتیو جێ هێشـتبێت، وێنەیەك تابلێی جەرگبڕ بوو. بەجۆرێك سـەرنجی ئەو خەڵکەی ڕاکێشـابوو، بیهێننە بەرچاو ئافرەتێك لەو تەمەنـە پیاوی نەمابێت، لەگەڵ چەنـد منداڵێکدا، دەبێت حاڵیـان چۆن بێت؟! ئەمانە هەسـتێکی سـەیری لای کەمەران درووسـت کرد، خەیاڵێکی دوورو درێژ ئـەوی لەئامێز گرتبوو، بەشـێوەیەك بێئاگای کردبوو لە گوتارەکەی هەینی، تەنها بیری لای ئەو ئافرەتو منداڵانە بوو، بەو نیازەی کە وتارەکە تەواوبێت هەرچی لە گیرفانییەتی پێیانی ببەخشێت. ئەوەبوو لەگەڵ "أقم الصلاة"ی مامۆسـتا بەئاگا هاتەوە، کاتێـك نوێژ تەواوبوو لێیان نزیـك بوویەوە دەسـتی بۆ گیرفانی برد. بیـری نەبوو ئەو بە جلی تایبـەت بەنوێژ هاتووە، هەرچـی پارەوپووڵە لە گیرفانی پانتۆڵەکەیەتی لەماڵ نەیهێناوە. بۆیە بەپەلە گەڕایەوە ماڵەوە؛ تاکو پارە بهێنێت. لە خەڵك وابوو شـتێکی لەناکاو ڕووی داوەو هەواڵێکی ناخۆشی پێ گەیشتووە. بۆیە هەریەکەو دەیپرسی. چی بووە؟ چی ڕووی داوە؟ شتێك بووە؟

ئەویـش بـەدەم ڕاکردنەوە دەیگوت: هێهـ هێهـ هێهـ نەخێر هیچ نەبووە، بەڵام کارێکی بەپەلەم هەیە. تا گەڕایەوە سـەیری کـرد خەڵکەکـە پەرتەوازەی کـردووە، ئافرەتەکـەش بەهەمان شـێوە لەوێ نەماوە. ئای خوایەگیان ئێسـتا چـۆن بیدۆزمەوە، هەرچەندە سـەیری ئەملاو ئـەولای کرد دیارنەبـوون. دەبێت خەڵك هاوکارییان کردبێت؟ پیاوێك لەسەر شەقامەکە چاوەڕێی تەکسی دەکرد، کامەران لێی پرسی؟



# ژنە سواڵکەرەکە



ئافرەتێکت نەبینیوە لەگەڵ چەند منداڵان؟

- بەڵێ بینیم چاوەڕێی سەیارەیان دەکرد، دواتر بە ئۆتۆمبێلێك ڕۆیشتن. کامەران هەرچیی دەکرد نەیدەتوانی ئەو دیمەنە لەیاد بکات. بۆ شەوەکەی، تا بەیانی بیری لای حاڵی ئەو ئافرەتو منداڵانەبوو.

پەروەردگارا دەبێت ئەم شەو چۆن بەسەر بەرن؟

ئیتر هەموو هەینییەك چاوی دەگێڕا، بەڵام هیچ سۆراغێکیان نەبوو. ئیتر بێئومێد بوو لەوەی جارێکی تر بیانبینێتەوە. ڕۆژێکیان کامەران لەبازاڕ بەنێو کۆڵانی بەرگدرووان گوزەری دەکرد؛ بۆئەوەی جلێکی تازە بەدوورین بدات. بینی پیاوێکی چوارشانەی دەمانچە لە قەد، لەگەڵ ئافرەتێکی شۆخو شەنگ کە دەستو قۆڵی پڕبوون، لە بازن سەر پەنجەکانی دەستی لەخەنە گرتبوو. ئەویش لە سەیرکردنی ئەو پیاوو ژنە لە دڵی خۆیدا گوتی: ئای خودایە، کەس سەر لە بازاڕی تۆ دەرناکات، هەندێ کەس چۆن دەژینو هەندێکیش لەمزگەوتەکان بۆ پارویەك نان سواڵ دەکەن. لە پڕ ئافرەتەکە سەیری قوماشەکانی لای ڕاستی کرد، بەڵام چی بینی، لەناکاو تووشی شۆك بوو، بەجارێ حەپەسا. ئەوە چییە؟

دەبێ من هەڵەبم؟خۆ ئەوە هەمان ئافرەتە سواڵکەرەکەیە ئێستا بەوشێوەیە دەیبینم. لە دڵی خۆیدا گوتی: مرۆڤ نابێت گومانی خراپ ببات، ئیتر داماوە نەیتوانیوە بەو شێوەیە ژیان بەرێ بکات، دیارە شووی کردووەتەوە، خواش حەڵاڵی کردووە دەستی خۆشبێت کارێکی چاکی کردووە.

ئیتر ئەو مەراقەو خەفەتە لە دڵی کامەران دەرچوو. دوای بەسەرچوونی ماوەیەکی زۆر بەسەر ئەو بابەتە، ڕۆژێکیان بەهەمان شێوەی ڕۆژی هەینی، دوای نوێژ سەیری کرد ئافرەتێك لەناو خەڵکدا وەستاوە دەگریو هاوار دەکات: برا موسوڵمانەکان بکەن بۆ خاتری خوا، منداڵی هەتیوم هەیە بۆم بەخێو ناکرێت زەعیفەم بێدەرەتانم، لە ڕاهی خودا یارمەتیم بدەن، ئەویش هێواش هێواش بەناو خەڵکەکەدا چوو بۆ لای؛ تا جاری پێشوو ئەو چاکەی لەدەست نەچێت. وەك ئەو خەڵکە خێری خۆی بکاتو یارمەتیی ئەو ژنە لێقەوماوە بدات، بەڵام کە بینی تەواو تێی ڕاما، ئیتر چی چاوەکانی ئەبڵەق ما، خەریك بوو باوەڕ بە چاوەکانی نەکات، مووی لەشی گرژ وەستا، تۆ بڵێی کەسانی وا هەبن؟

ڕێك لەو کاتانەدا کە مرۆڤ لە هەموو بە هاوڕەوشتێکی مرۆڤایەتیو ویژدانی دادەشۆرێت؛ چونکە ئەوەی ئەو بینی هەمان ئافرەتە سواڵکەرەکەی جاران بوو، کە جارێك لەگەڵ پیاوی خۆی دەیبینی لە بازاڕو جارێك لە کاتی سواڵکردن. ئەو کات تێگەیشت ئەو ئافرەتە پیشەی هەمیشەییەتی، ئینجا قسەی پیاوەکەی سەرشەقامی بیر هاتەوە، کە پرسیاری لێ کرد: ئەویش گوتی: بە سەیارەیەك ڕۆیشت، بۆیە لەدڵی خۆیدا گوتی: ئێستە دەبێت چەند کەس هەبێت بەو شێوەیە خەڵك فریو بدەنو سوود لە هەستو سۆزیان وەربگرن. گومانیش لەوەدا نییە کەسانێك هەن لە ژیانێکی کولەمەرگی دەژین، بەڵام نەفسی بەرزیان ڕێگایان پێ نادات، دەست بۆ هیچ کەسێك پان بکەنەوە، هی واش هەیە لەناچاری ڕوو لەخەڵکانێك دەکەن، کەچی بەداخەوە کەسانی وەك ئەو ئافرەتە وا دەکەن، خەڵك متمانە بەهەژارە ڕاستگۆکانیش نەکەن.

# چەند دەنکە برنجێك

درەخشان بەهادین

هاوڕێیەکم بۆی گێڕامەوە: ماوەی چەند ساڵێك لەمەوبەر بۆ کارێکی بازرگانی چووە بۆ وڵاتی چین، لەوێ بازرگانە چینییەکەی هاوڕێی، بۆ ژەمێکی نانخواردن دەیبات بۆ چێشتخانەیەکی چاك لە شاری پەکینی پایتەخت، خواردنەکەیان خواردنێکی چینی دەبێت، کە لە برنج درووست کراوە . هاوڕێیەکەم گوتی: لە کاتی نانخواردندا، چەند دەنکە برنجێك دەکەوێتە سەر مێزەکە، کاتێك خزمەتگوزارەکە هاتە لایان؛ تا مێزەکە خاوێنو ڕێك بکاتەوە، کە بینی چەند دەنکە برنجێك لە بەردەمی من کەوتووەتە سەر مێزەکە، زۆر بە ئەدەبەوە گوتی: "ئیزن ئەدەن ئەم برنجانە کۆ بکەمەوە؟" کاتێك لە هۆکاری ئەم کارەم پرسی گوتی: "وڵاتەکەی من زیاتر لە یەك ملیار ژمارەی دانیشتوانەکەیەتی، ئەگەر هەر یەك لە ئێمە تەنها 10 دەنکە برنج خەسار بکات؛ ئەوا ئەندازەیەکی زۆر بە فیرۆ دەچێت، ئێمە لەم وڵاتەدا حەقی زیادەڕۆییمان نییە، کەسیش لەو هەڵەیە نابوورێت."

# گەڕانەوە بۆ خاك

ئیبراهیم خەتەیی

ئـەو كات تەمەنم حەوت سـاڵان بوو، خـۆمو باوكم بەرەو ماڵەوە دەگەڕاینەوە. سـێبەری شاخەكان تەواوی لادێكەی داپۆشی بـوو. تیشـكی خۆر بـە ڕەنگێكی پرتەقاڵـی ئەفسـووناوییەوە، بەهێمنـی ماڵئاوایـی لە لقی بـەرزی ئەسـپیندارەكانو لوتكەی چیـاكان دەكرد. درەختـەكان بەدەم سـیمفۆنیای دەنگی باڵندەو خوڕەی ئاوو كزەبای پایزەوە، خەریكی سەمای ماڵئاوایی ڕۆژێكی تـری ئەو ئاوەدانییە بوون. گەر بە چەشـنی تابلۆیەكی ڕێنوارو بە دڵێكی ئارامەوە، سەیری ئەو دیمەنەت بكردایە، نە چاوەكانت تێر دەبوونو نە هیچ وشـەیەكت دەسـتدەكەوت بۆ وەسفكردنی ئـەو جوانییە. هەر دیمەنێـك لە ژیاندا چەندیـن دیوی هەیە، مرۆڤەكان بەپێی لێكدانەوەی ناخیان جیهان دەبینن.

مـن ئـەو كاتـە زۆر سەرسـام بـووم بـە دیمەنـی ئـەو پێشمەرگانەی ئێواران دەبوونە میوانی ماڵەكان. زۆربەی شەوەكان چەند پێشمەرگەیەك لەگەڵ باوكم دەهاتنەوە ماڵی ئێمەو كاتێك بەیانییەكەی خەبەرم دەبووەوە، ئەوان ڕۆیشتبوون.

باوكم هەمیشـە دەیگوت: پێویستە ڕێزیان لێ بگرین؛ لەبەرئـەوەی ئەوانـە ماڵی خۆیان جێهێشـتووەو لە پێناو ئاسوودەبوونی ئێمە، تێدەكۆشن.

ئێسـتاش بیـرم ماوە. وەك ئـەوەی هەموو جیهانـم لەباوەش گرتبێـت، بەهەردوو دەسـتە لاوازەكانم ئۆتۆمبێلە تازەكەم بەسـەر سینگمەوە توند كردبوو. خەیاڵە جوانەكانم بەجۆرێك شنەی بزەیەكی بەردەوامیان بۆ هێنابووم، لێوەكانم بەیەكتر نەدەگەیشتنەوە.

(هەموومان پێكەوە بە ئۆتۆمبیل دەچین بۆ گەشتو سەیران. خۆم دەبم بە شـوفێرو باوكیشم لە تەنیشتمەوە دادەنیشێت! كە گەورە بووم، ئۆتۆمبیلێكی بەڕاسـتی دەكـڕم، لەگەڵ خانوویەكی گەورەدا، كە گەورە بووم دەبم بە مامۆستا).

-دەنگی هۆڕنی ئۆتۆمبیلەكانی دواوە، خەیاڵەكانی پچڕاند-

- ئـاااى چ سـەردەمانێك بـوون. ئەوەتا ئێسـتاش بووم بە مامۆسـتای زانكۆ، خانوویەكی گەورەشـم هەیەو ئۆتۆمبێلیشـم هەیـە، جیاوازییەكە ئەوەیە، كە باوكـم چۆتە ڕێگەی خۆیو لە جیاتـی ئەو، كوڕەكەم لە تەنیشـتم دانیشـتووە! بـەڵام نەخێر! ئێسـتا جیاوازیـی زۆر هەیـە. ئێمـە لەسـەردەمی منداڵیماندا، تەنیا دیوە جوانەكانی ژیان دەبینین، ڕاسـتە ئێسـتا هەموو ئەو شتانەی خەونم پێیانەوە دەبینی، بەدەستم هێناون، بەڵام كاتێك گـەورە دەبین، دیوە ناحەزەكانی ژیان، هەسـتی چێژوەرگرتنمان لەبـار دەبەن، هەر لەبەر ئـەوەش هەركاتێك دەممان دەكەینەوە



دەڵێین: جاران لە ئێستا خۆشتر بوو. ڕاستییەکە ئەوەیە کە جاران و ئێستا جیاوازییەکیان نییە، بەڵکو ئەوە تێڕوانینی ئێمەو ڕووبەڕووبوونەوەمان بۆ شتەکانە، گۆڕانکاری بەسەردا دێت. لە منداڵیمدا تەنیا بۆنی خاکم لە دەستی قەڵیشاوی باوکم دەکرد، بەڵام ئێستا کە گەورە بووم، بۆنی زامو ماندووبوونو ئازارەکانی دەکەم. خۆزگە چەمکەکان هەر بەو جوانییەی سەردەمی منداڵی دەمانەوە. جوانیو شکۆی ناوی ئەو پێشمەرگە چاونەترسەی کە تەنیا لە پێناو خاکو نیشتمان، بێبەرامبەر تێدەکۆشاو تەنیا بەناوهێنانی، دوژمن ڕادەچڵەکی، نەك ئەو پێشمەرگەیەی ئێستا، کە نەبوونیو مەینەتیو بەزەیی پێداهاتنەوەمان بیر دەخاتەوە، جوانیی شکۆی ئەو مامۆستایەی کە بەئازادی، پەیامی زانستی بە کۆمەڵگە دەگەیەنێت، بێئەوەی مافی زەوت بکرێتو بۆ پارووەك نان بنووزێتەوە، وێڕای ئەوەش ناچار بکرێت، کوڕی بەرپرسێك بەناهەق بەسەر کوڕە هەژارێکی زیرەکدا سەر بخات، ئێمە لەسەر ئەم خاکەدا، هەر لە منداڵییەوە، یەك لەدوای یەکی دیمەنە جوانەکانی ژیانمان، لا ناشیرین دەکرێن، تا کاتێك گەورە دەبین شتێك نامێنێتەوە، حەزی بینینمان دابمرکێنێتەوە.

ئەمجارەیان دەنگی شاخەوانی کوڕی خەیاڵی پچڕاند:

-بابەگیان، منیش حەز دەکەم وەك تۆ گەورە بم، بەڵام کەی گەورە دەبم؟

-پەلە مەکە کوڕی خۆم، گەورە دەبیت.. بەڵام بۆچی دەتەوێت گەورە بیت؟

-دەمەوێ وەك تۆ ئۆتۆمبیلێك بکڕم، بەڵام دەبێت ئۆتۆمبێلەکەی من ڕەنگی سوور بێت. بابەگیان بۆچی ئۆتۆمبێلێکی سەقف سلاید ناکڕیت؟

-کە تۆ گەورە بوویت، ئۆتۆمبیلێکی سەقف سلایدی ڕەنگ سوور بکڕە، باشە کوڕی خۆم!

خۆزگەم بە بیرکردنەوەی پاكو بێگەردی منداڵی، ئەوەتا خۆمناسا، خەون بە گەورەبوونەوە دەبینێت، وەك ئەوەی لە گەورەبووندا هەموو دەروازەکانی ژیان واڵا ببنەوە، منداڵ پێی وایە هەموو شتەکان بەو جوانییە گەورە دەبن کە ئێستا دەیان بینێت.

بۆ ساتێك حەسانەوە، ئۆتۆمبێلەکەی لەبەردەم چایخانەیەکی قەراغی شەقامەکە ڕاگرت. سەیرێکی کاتژمێرەکەی کرد، زیاتر لە کاتژمێرێکە بەڕێوەیە. کەواتە: نیوەی ڕێگاکەی بڕیوە. منداڵەکە، ئۆتۆمبێلە سوورەکەی توند لەباوەش گرتبوو، بەدەم خەیاڵەکانییەوە خەوی لێ کەوتبوو، بزەیەك لەسەر لێوەکانی قەتیس مابوو، بەجۆرێك شوێنی ددانە کەوتووەکانی دەرکەوتبوون. لە ئۆتۆمبێلەکە دابەزیو لە دوکانی تەنیشت چایخانەکە هەندێك پێداویستی کڕی. لەژێر ساباتی چایخانەکە لەسەر سەکۆیەکە دانیشت کە لە بەرد درووستکرابوو فەرشێکی کۆنی لەسەر ڕاخرابوو. چایچییەکە، کامرە پیاوێکی خوێنشیرین بوو، چایەکی بۆ هێناو گوتی:

-مامۆستا تۆ لە شار هاتوویتو هیلاکو ماندوویت، ئەو چایە بخۆیتەوە، شەکەتیت دەڕەوێتەوە... ئۆغرت خێر بێت، بەرەو کوێ دەڕۆیت؟

-بەرەو لادێکەمان دەچین، لەودیوی ئەو شاخەیە.

-واتە: نانتان نەخواردووە، ئێستا دەچینە ماڵەوەو نەمەکێکم بکەن، لەلای مامی خۆتان پاروونانێك بخۆن، ئینجا بڕۆن.

-خودا لێتانی بەزیاد بکات، نانمان خواردووەو ڕێگاکەشمان زۆری نەماوە، چایەکەت زۆر بەتام بوو، دەستت خۆش بێت، کەمێك بحەسێینەوە، بەڕێ دەکەوینەوە.

- نۆشی گیانتان بێت کوڕی خۆم، ژیانیش هەر بەو شێوەیە، بەڕێدا دەڕۆینو ماندوو دەبین، بۆیە پێویستە ناوەناوەش حەسانەوەیەك بەخۆمان بدەین، بەڵام گرنگ ئەوەیە ڕێگەمان ون نەکەینو بزانین بەرەو کوێ دەڕۆین.

لەدوای گفتوگۆیەکی سادەو پڕ لە واتا لەگەڵ مامەی چایچی، مامۆستا ماڵئاوایی کردو بەرەو لادێکەیان بەڕێکەوتن.

بەهۆی تاسەیەکی ڕێگە خۆڵییەکەوە، منداڵەکە خەبەری بوویەوە.

-بابەگیان گەیشتین؟!

- زۆرمان نەماوە کوڕی خۆم.

لە دوایین پێچی چیاکە سەردەکەوتن، چەمی لادێکە لەژێر سێبەری پەڵە هەورەکاندا لەگەڵ تیشکی خۆر لە چاوشارکێدابوو. ڕێگاکە سێ پێچی تر بە چیاکەدا بەرەو خوارەوە دەگەیشتە پردە دارینەکەی سەر ڕوباری ناو دۆڵەکە. شنەی چنارەکانی دەم ڕوبارو کۆزە ئەسپیندارەکان، بۆنی خاكو ژیانیان بەو ناوەدا پەرش دەکردو هەموو هەوای ناپاکی شاری لەناو سییەکانی مرۆڤ ڕاو دەنا.

لە کۆتاییدا گەیشتین، وا ئەمجارەش بە بینینی لادێکەمان شاد بووینەوە، خانووە قوڕینە نزمەکان، دووکەڵکێشو باگردانی سەربانەکان، ئەو پێشەبانانەی پێچەوانەی باڵکۆنی خانووی شارەکان، پڕن لە جموجۆڵو ژیان. ئەوە خانوە کۆنەکەی ئێمەیە، چەندین ساڵە پشتگوێ خراوە، پێویستە پاك بکرێتەوە، دەتوانین ڕێڕەوی ڕووبارو کانیاوەکانیش پاك بکەینەوە، قوتابخانەکەش ئاوەدان بکەینەوە؛ بۆئەوەی چەمکە جوانە بێنازەکان بۆ خۆمانو بۆ نەوەی نوێ ڕاست بکەینەوە، کرێژی خۆپەرستیو بێگانە پەرستیو گەندەڵی، لەسەر بەها جوانەکان ڕابماڵینو شکۆی زانست، مامۆستا، قوتابی، پێشمەرگەو برایەتی، و..هتد.. بگێڕینەوە.

یادی دەستی قەڵیشاوی باوکم دەکەم، یادی بۆنی خاكو خوڕەی ئاو دەکەم، یادی بەها بەرزەکانو سادەییو پاكو بێگەردیو برایەتیی بێبەرامبەر دەکەم، بۆیە ئیتر بڕیارم دا لێرە نیشتەجێ ببمەوە، بگەڕێمەوە بۆ جوانیو بۆ سادەیی، بگەڕێمەوە بۆ خاك!

# نامە نورییەکان

## نامەی پەنجاوهەشت

ع. ش. شێرکۆ

شەوە درێژەکانی پاییزە ئازیزم،.....

بۆ خواویستانو عابیدان غەنیمەتە، ئەم وەرزە لای ئەولیایانی خودا، وەرزی ئاڵتوونیی عیبادەتو خواپەرستییە! ڕۆژانی کورت بۆ ڕۆژووگرتنو شەوانی درێژ بۆ موناجاتو نوێژو نزاو پاڕانەوەو یادی خودا!

ئەمە خولیای بەندەکانی خودان، ئەوانەی بەڕاستی بەندەی خودان!

چونکە مرۆڤ بەندەی ئەو شتەیە، کە تەوقی کۆیلایەتی بۆ کردۆتە گەردن، ئەوەی ئەسیرو بەندی کۆتو زنجیری نەفسی خۆیەتی، ئەوە بەندەی نەفسە، نەك بەندەی خودا!

ئەوەی کۆیلەی دونیایەو شەوو ڕۆژ لە خزمەتی ئەودایە، ئەوە بەندەی دونیایە، نەك بەندەی خودا!

خۆ بوون بە بەندەی خودا، هەر ئاوا ئاسان نییە، زۆرن ئەو کەسانەی کە وا دەزانن بەندەی خودان، بەڵام لە ڕاستیدا، بەندەی نەفسو هەواو ئارەزووەکانی دونیاو شەیتانن، بەڵام دانی پێدا نانێن!



یەکێك لە پیاوچاکان، کابرایەکی بینی، لێی پرسی: پیشەت چییە؟

گوتی: خەربەندەم، بە فارسی واتە: بەندەی گوێدرێژەکەمم!

خۆ کەسانی وەها زۆرن، بەڵام ناتوانن وەك ئەم کابرایە ڕاستگۆ بن!

پێغەمبەری ئازیز دەفەرموێت: (تعس عبد الدرهم، تعس عبد الدينار...) البخاري.

چی بەڵایەکی گەورەیە، کە پێغەمبەر دوعا لە بەندەی دینارو درهەم بکاتو دوعای داماویو خەسارەتمەندییان لێ بکات!

کاتێك مرۆڤ زۆربەی ساتەکانی ژیانی بۆ جەمعی دونیای فانیو کۆکردنەوەی مەتاعی دونیایەو دڵی وابەستەی پارەو سامانو زێڕو زیوەو لە نوێژەکەشیدا خەیاڵی هەر لای پارەکانێتی، ئیدی چۆن لافی بەندایەتی بۆ خودا لێ دەدات؟!

چونکە خۆشەویستیی دونیاو ئالوودەبوونی، یەکێکە لە نیشانەکانی دەردەسەریو داماوی، نەك بەختەوەریو سەعادەت، وەکو خەڵکی گومان دەبەن.

فوزەیلی کوڕی عەیاز دەڵێت: "پێنج شت لە نیشاکانی داماوین: دڵڕەقی، وشکی چاو، بێشەرمی، خۆشەویستیی دونیا، هیوادرێژی بەدونیا".

جا ئازیزم، کەسانێك دەتوانن شەوانی درێژی پاییز، بە چرای موناجاتو قیامو زیکرو خوێندنەوەی قورئان ڕووناك بکەنەوە، کە تامی لەزەتی "بەندایەتی"یان بۆ خودا کردووەو پشتیان کردۆتە دونیای فانیو دڵیان ئاوەدانە بە خۆشەویستیی خوداو نەبوونەتە حەماڵی مەتاعی دونیاو بەندەی پەڕۆو پاتاڵی دونیا!

چونکە هەرکات خۆشەویستیی دونیا، دڵێك داگیر بکا؛ وەها سەرقاڵی دەکات، یادی خودای بیر دەباتەوە، کە تەواو غافڵو بێئاگا بێ، وەکوو مەحوی شاعیر دەڵێت:

**خەیاڵی پووچی دونیا، وا دەماغو دڵمی پێچاوە**
**قیامەت هەر مەگەر ڕۆژی قیامەت بێتەوە فکرم**

پیاوچاکانی ڕاستەقینە.. چونکە بەڕۆژ ملکەچی فەرمانی خودا بوون، لە شەودا خوداوەند لە ژوانی ئیلاهی پێشوازی لێ دەکردن.

ساتەکانی شەوو کاتەکانی موناجاتی ئیلاهی هێندە لە دڵیاندا شیرین بوو، دڵیان نەدەهات، چۆڵی بکەن.

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر، حەوزێکی چکۆلەی هەبوو، پێش ئەوەی بخەوێ، چەندی بتوانیایە، نوێژی دەکرد، پاشان دەچووە جێگای نووستنو هێندەی خەوی باڵندەیەك، تۆزێك چاوی لێك دەنا، پاشان ڕادەپەڕیو دەستنوێژی هەڵدەگرتو دووبارە نوێژی دەکرد، شەوانە چوار پێنج جار، ئەم کارەی دووبارە دەکردەوە!

ئەبوعوسمانی نەهدی دەڵێت: حەوت جار ئەبوو هورەیرەم داوەت کرد، شەوانە خۆیو خێزانەکەیو خزمەتکارەکەی، شەویان دابەش کردبوو بە سێ بەشەوە، سەرەتا یەکێکیان نوێژی دەکرد، دواتر دووەمی هەڵدەستاند، پاشان سێیەم هەڵدەستا!

واتە: شەو تا بەیانی، ماڵیان ئاوەدان بوو بە قیام لە موناجاتی خودایدا!

سەعیدی کوڕی موسەییەب، پەنجا ساڵ نوێژی بەیانیی بە دەستنوێژی نوێژی عیشا کردووە!

هەر ئەو سەعیدە، چل ساڵ لەسەر یەك، بانگ نەدراوە، ئیللا لەنێو مزگەوتدا بووەو چاوەڕوانی نوێژی کردووە.

عەلی کوڕی فوزەیلی کوڕی عەیاز، کە لاوێکی تازەپێگەیشتوو بوو، شەوانە شەونوێژی دەکرد، تا بەسکەخشێ دەچووە نێو جێگاکەی، پاشان ئاوڕی دەدایەوە بۆ لای باوکیو دەیگوت: باوەگیان، خواناسان پێشم کەوتن!

ئیمامی شافیعی، شەوی کردبوو بە سێ بەشەوە: بەشی یەکەمی دەینووسی، بەشی دووەمی نوێژی دەکردو بەشی سێیەمی دەخەوت.

خۆ ئەگەر باسی بەری بەیانو شنەی سەحەر بکەین؛ ئەوە کاتی کۆڕی گەرمی زیکرو ئیستغفاری خواناسانو خۆشەویستانی خودایە، سەداو زایەڵەی ﴿وَالْمُسْتَغْفِرِينَ بِالْأَسْحَارِ﴾ ـەو دەنگی گریانوناڵەو ئەنینی ﴿وَبِالْأَسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ﴾ ـە.

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود، کاتی سەحەر دەیگوت: «اللهم دعوتني فأجبتك.. وأمرتني فأطعتك.. وهذا سحر فاغفر لي».

کاتێك لێیان پرسی: بۆچی کاتی سەحەری ئاوا تایبەتمەندکردووە؟

گوتی: کاتێك کە یاقووب پێغەمبەر (درووودی خودای لێ بێ) بە کوڕەکانی گوت: ﴿سَوْفَ أَسْتَغْفِرُ لَكُمْ﴾ یوسف: ٩٨ دوعاکەی دواخست بۆ کاتی سەحەر!

تاوسی کوڕی کەیسان لە کاتی سەحەردا، سەردانی کابرایەکی کرد، گوتیان خەوتووە!

گوتی: نەمزانیووە تا ئێستا کەسێك هەبێت، کە کاتی سەحەر خەوتبێ! واتە: پێی سەیربوو، چۆن کەسێك لەو کاتە پیرۆزەدا دەخەوێت!

لەگەڵ ئەوەشدا شەرمیان لە خودا دەکردو وێڕای خواپەرستیو عیبادەتی زۆر، ڕووی ئەوەیان نەبوو، سەری بەندایەتی بڵند بکەن، بەڵکو هەمیشە شەرمەندە دەبوونو تەنها چاویان گوناهو تەقسیری دەبینی!

یەحیای کوڕی مەعازیش دەیگوت: کەسێك کاتی تاعەت، شەرم لە خودا بکات، کاتی گوناهکردنیش خودا شەرمی لێ دەکات!

باسکردنی ژیانی شەیدایانی شەوو خواناسانی ڕاستەقینە بەردەوامە، تا نامەیەکی دی، بە خودات دەسپێرم!




# لەگەڵ کتێبدا

نازیزان، لەم ژمارەیە بە دواوە، پێم خۆشە لە دوا لاپەڕەی گۆڤارە خۆشەویستەکەتانداو پێش ماڵاوایی، بە هاودەمیی کتێبێك بێمە خزمەتتان.

حەزم کرد سەرەتا لەم کتێبەوە دەست پێ بکەم: "چارەنووسی ئادەمیزاد"؛ چونکە مێژووی ئاشنابوونی من لەگەڵ ئەم کتێبەدا، دەگەڕێتەوە بۆ زێتر لە "٣٠" ساڵ..

لەم ڕۆژانەدا ڕێم کەوتە کتێبخانەی گشتیی سلێمانیو جارێکی دی بە دیداری ئەو کتێبە گەیشتمەوەو وەکو هاوڕێیەکی کۆن، میوانداریم لێ کردو هێنامەوە ماڵو دەستم کردەوە بە خوێندنەوەی.

ئەو کتێبە ڕۆمانێکی کورتە، لە نووسینی نووسەری ڕووسی "میخائیل شولۆخۆف"ەو د. ئەورەحمانی حاجی مارف، لە ڕووسییەوە کردوویەتی بە کوردیو محەممەدی مەلا کەریمیش پێیدا چووەتەوەو ساڵی ١٩٨٠ لە بەغداد چاپ کراوە.

بەندەش ساڵانی ١٩٨٣ — ١٩٨٤ خوێندبوومەوە، کە ئەو کات لە پۆلی دوو و سێی سەرەتایی بووم.

ئەم کتێبە، یەکێکە لەو کتێبە خۆشانەی کە خوێندوومنەوەو هەرچەندە من لە تەمەنێکی منداڵیشدا بووم، بەڵام زۆرباش تێی دەگەیشتم، بەحوکمی تێکەڵاویم لەگەڵ کۆمەڵە لاوێکی شارۆچکەی ئاغجەلەر، کە ئەوان لەمن گەورەتربوونو قوتابیی ناوەندیو ئامادەیی بوون، جگە لەوەی خۆمان خاوەنی کتێبخانەو کتێبی زۆربووین، بەڵام لەوان ئەو کتێبانەم وەردەگرت، کە نەمانبوو، وەك ڕۆمانو چیرۆكو هەندێك دیوانی شیعری شاعیرانی کلاسیکی کوردی.

لەو گەنجانەش کە پێم وابێ، ئەو کتێبەم لێ وەرگرتو منیش لە کتێبخانەکەی باوکم، ئەو کتێبانەم پێ دەدا، کە ئەو نەیبوو، کاك "هیوا ناصح" بوو، کە زۆر دەمێکە لێك دابڕاوینو وا بزانم ئێستا لە هەندەرانە!

ئەم ڕۆمانە، زمانێکی سادەو خۆشو بێگرێوگۆڵی هەن، کە مرۆڤ لە خوێندنەوەیان تێر نابێو حەز ناکات دەستی لێ هەڵبگرێ، وەسفی جوانو خەیاڵی ناسکی تێدان.

لەوێدا، پاڵەوانی ڕۆمانەکە، زۆرجوان وەسفی خێزانەکەی خۆی دەکات، ژنێکی ژیرو وردەکار، توانیویەتی بە گرنگیدان بە پیاوەکەیو ماڵو منداڵەکەی، بەهەشتۆکەیەك درووست بکات.

بەم شێوەیە وەسفی کاتی ماڵاوایی کردنی لێ دەکات بەرەو بەرەکانی جەنگ:

ــ گیانەکەم، ئێرینا! وەرە بەر مەدە، وەرەوە سەر خۆت! هیچ نەبێ وشەیەکم بۆ خواحافیزی پێ بڵێ. وەك کەسێکی لاڵ هاتە دەنگ، بۆ دەربڕینی هەر وشەیەك، تفێکی قوت دەدا:

"ئەندرووشا! گشت کەسەکەم.. جارێکی تر.. لەم جیهانەدا.. منو تۆ.. یەکتر نابینینەوە.

ئەم کتێبە باس لە شەڕی ڕووسو ئاڵمان دەکات، لە جەنگی جیهانیی یەکەمدا، هیوادارم دەستتان بکەوێتو بیخوێننەوە، ئومێدەواریشم بتوانین لە "بڕیار" چاپی نوێی بکەینو بیخەینە بەر دیدی ئێوەی بەڕێز!

لەگەڵ پارچەیەك لەو ڕۆمانە، ماڵاواییتان لێ دەکەم ـ هەر شاد بن ـ

ـ "ڤانیا! تۆ دەزانی من کێم؟"

هەناسەیەکی هەڵکێشاو گوتی:

ـ "کێی؟"

هەر بەو ناسکییە پێم گوت:

ـ "من باوکتم".

خوایە! ئەمە چییە ڕوو دەدا؟ خۆی هەڵدایە سەر سنگم، دەستی کردە ملم، کەوتە ماچکردنی ڕوومەتەکانم، لێوەکانو ناوچاوانم، وەك سیسرك دەیسیڕاند، ناسك دەیقیژاند:

"بابەگیان! دەمزانی! دەمزانی دەمدۆزیتەوە.. هەر دەمدۆزیتەوە. من زۆرم چاوەڕوانی کردی، کەی دەمدۆزیتەوە؟" باوەشی پێدا کردبووم، وەك شۆڕەبی لەبەر ڕەشەبادا دەلەرزی. منیش بەرچاوم تاریك بوو، گیانیشم هەموو دەلەرزی، دەستم سوکانی ئۆتۆمبیلەکەی نەدەگرت. نازانم چۆنم لەو کاتەدا لەدەست بەر نەبوو؟ بەڕاستی خۆم سەرسامم.

شەو لە تەنیشتییەوە پاڵ کەوتمو بۆ یەکەم جار لەو ماوە دوورو درێژەدا، خەوێکی خۆشم کرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، چوار جارێك هەڵستام، خەبەرم دەبووەوە، دەمبینی لە بنباخەڵما، وەك چۆلەکە لە بنباڵی دایکیدا مشەمشی بوو، بەڕادەیەك شادمان بووم، لەگوتن نایەت، نەدەجووڵامەوەو نقەم لە خۆم بڕیبوو، نەوەك خەبەری بێتەوە، بەڵام خۆمم پێ نەگیرا، لەسەرخۆ هەستام، شقارتەیەکم داگیرساند، هەرچەندم تەماشا دەکرد، تێرم لێ نەدەخوارد.